ناوی کتێب: ئەو بەختەوەرییەی جیهان بەدوایدا وێڵە

نووسەر: ئیمان ئازاد عمر (کۆلێژی پەروەردە)

ژانەر: گەشەی مرۆیی

پێداچوونەوەی کتێب:م.هەرمان احمد

هاوکار: نەهرۆ جەرجیس

چاپ و بڵاوکار:

حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ /M.Ktebxana

بەرگ و ناوەڕۆك: محمد صدیق ابابکر

نۆبەتی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: 2023

نرخ: 2500

ئەم کتێبە ژمارەی سپاردنی ( ) لەلایەن ( ) بۆ ساڵی ( ) پێدراوە

## پێڕست

ئەم کتێبە پێشکەشکە بە:

خانەوادەکەم، بەتایبەت دایک و باوکم. براکەم، کە هەمیشە پاڵپشت و هاندەرم بووە.

هاوڕێی ئەزیزم، ژیلە ئەحمەد

هاوڕێیانی کۆلێژ، کە بە وشە جوانەکانیان زێتر بەرەو پێشیان بردووم.

زانکۆی سەلاحەدین. کۆلێژی پەروەردە. بەشی بایلۆجی

(کۆلێژی پێشەنگ لەپەروەردە و فێرکردن)

## پێشەکی

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە جیاوازی چیە لە نێوان مرۆڤ و ئادامیزاد ؟ ئایا بە ڕاستی خودای گەورە باشیەکانی بۆ ئێمە داناوە ؟ ئێمەی مرۆڤ چۆن لە شکست نەترسین ؟ .

هەرچەندە ئێمە لەسەر ئەم زەمینە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ژیانی تێدا بەڕێ دەکەین، بەڵام دەبێت سنوری ڕەفتارمان و هۆکاری بەدیهێنانمان بزانین، ئاخۆ هەر لە خۆڕایی و تەنها چەند ساڵێك دەژین و تەواو ؟ یان ئامانجێکی تر لە پشت بوونمان هەیە ؟ .

لێرەدا ئاشکراکردنی توانا لە بن نەهاتووەکانی ئێمە کە خودای گەورە دروستی کردووین بێ کۆتایە، ئەی بۆچی ڕێ ناکەین بەرەو لوتکەی گەشەسەندنی مرۆڤایەتی ؟.

ئەم کتێبەی کە ئێستا لەبەر دەستت دایە گەشتێکی جوانی ڕۆحانیە بۆ نێو ئەم پرسیار و گومانانەی کە مرۆڤ هەیەتی بەرامبەر تواناکانی خۆیی و خوداکەشی. بەهۆیەوە دەگەیت بەو پەڕی باوەڕ بەخۆبوون بە خودی خۆمان و باوەڕ بە تینتر بە خودای گەورە.

نازانم تۆ تەمەنت چەندە کە ئەم کتێبەت بەدەستەوەیە و دەخوێنیتەوە، بەڵام پیر بیت یان گەنج یان هەرزەکار ئەوە بزانە بۆ تۆ نوسراوە تا سودی لێ ببینی و بەهۆیەوە گەشتی زانیاریت لەنگەر بگرێت لە دەریای بەخشینەکاندا.

تاکە چارەسەر بۆ ڕوانینەوەی گومانەکانی نێو دڵمان یەقینی تەواومان هەبێت بە دەسەڵات و گەورەیی خودای گەورە، بەهۆیەوە جوانترین ڕەفتارەکانی نێو ژین بەرجەستە بکەین.

بەو هیوایەی ئەم کتێبە ببێتە هۆکارێك بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانت بەرەو کامل بوون، بڕیاردانت بەرەو باشتر بوونێکی ئەبەدی و لەبن نەهاتوو لە سایەی درێژەدان بەم ڕەوتانە:.

هەرمان احمد

6 شوباتی 2023

## دەستپێك

بەناوی پەروەرێنی میهرەبان، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە ئافراندوومی، خودایەک کە فێری هەموو کارو کردەوەیەکی باش و چاکی کردووم، لە هەموو کات و ساتەکانی ژیانم پاڵپشت و یارمەتیدەر و کار ئاسانکەرم بووە، لە هەموو کاتە شادی بەخش و دژوارەکانم لەگەڵم بووە، لە بەرامبەر سەختیەکان توانای خۆڕاگری پێ بەخشیوم و ئارمگری کردووم، لە شەوانی تەنیایی و نائومێدیم بە تروسکەی باوەر دووبارە توانا و ئومێدی پێ بەخشیومەتەوە، خودایەك لە هەموو کەوتنێکمدا هێز و توانا و ئیرادەی هەڵسانەوەی پێ داوم، بە خۆشەویستی مرۆڤە باشەکانی دەورووبەرم ئاشنای کردووم. لە ژێر سایەی پەروەردگاری زانا و داهێنەر توانیومە متمانەی کەسانی دەورووبەرم بەدەست بهێنم. تاکو ئەم ئاست و ڕۆڵەی ژیانم هاتووم، گشتی لە سایەی ئافرێنەری زەوی و

ڕێسمان و گەردوون بووە. بەهۆی خالقەوە لە ژینم شتێکم بەرجەستە نەکردووە بە ناوی شکست.

لە ئاکارە ڕاست و دروستەکان توانیومە سەرکەوتن بەدەست بهێنم، لە ئاکارە خراپەکانیش ئەزموونم کردۆتە دەستکەوت.

دەنووسم، تاکو پەیامی پڕ لە ئەزموون بە مرۆڤەکانی سەر ئەم هەسارەیە بگەیەنم. بەشێکی هەرە زۆری مرۆڤەکان ژیان بە سەختی و دژواری بەڕێدەکەن، بەڵام پێویستە بزانین سەختییەکان هۆکارن بۆئەوەی لەو جەنگەی کە ناوی ژیانە بیبەیتەوە. بە ڕێگەی ڕاست و دروستەکە ئاشنا بیت.

دەمەوێت لە دەستپێکدا لەبارەی باوەڕی مرۆڤەکان و ئایینی ئیسلام بێمە گۆ و بنووسم: ئێمەی مرۆڤ کاتێك لەسەر ڕێگەیەك ڕێ دەبڕین، ئایا هەرگیز بیر لەوە دەکەینەوە بۆچی ئەم ڕێگەیەمان هەڵبژاردووە؟

لە خۆمان دەپرسین ئەم ڕێگەیە بەرەو کوێمان دەبات؟ ئایا ویست و ژیرییمان ئەم ڕێگەیەی دەستەبژێر کردووە، یاخود لە باوانمانەوە وەك عادەتو تەقالید بۆمان ماوەتەوە؟ ئایە هەرگیز بیرمان لەوە کردۆتەوە کە ئەم ڕێچکەیەی گرتوومانەتە بەر ڕاستە یاخود هەڵە؟

لە یەکەم چرکەی هاتنە بوونمان، تۆوی باوەڕ لە دڵمان هەیە. لێرەدا دەوەستین! پرسیارە سەرسوڕهێنەر و گرنگەکە دەکەین، ئایا ئەم تۆوی باوەڕە، لەگەڵ گەشەی مرۆڤەکان و تێپەڕبوونی کات چەکەرە دەکات؟ یاخود دەتوانێت دوای چەکەرە کردن گەشە بکات بەو چەشنەی کە خوازیارە لە دڵ و دەروونماندا بچەسپێت و بۆ هەمیشە پتەوی دەستبخات؟ تا بگاتە ئەو ئاستەی کە پێی دەڵێن: "مرۆڤی باوەڕدار" یاخود "ئادەمیزاد"؟ ئێستا کاتی ئەوەیە تێبفکرین. تۆ نازناوی "مرۆڤی باوەڕدار" یاخود کرداریيەن سەلماندووتە کە دروستکراوێکی باوەڕداری

پەروەرێنی؟ هەڵبەتە ئەگەر پێتوابێت نەگەیشتوویتە ئەو ئاستە لە خۆتت پرسییوە بۆ؟ ئەگەر هۆکار هەیە دیاری بکە. ڕەنگە ئەو پرسیارە لە خەیاڵتدا دروست ببێت، بۆ پێویستە بگەین بەو ئاست و پێگەیەی باوەڕ؟

لە قۆناغی منداڵیدا، بە گوێرەی پێویست ئاوەز و عەقڵمان گەشە ناکات. بێگومان سروشتییەن وایە. بۆیە لەم قۆناغەدا هەست بە ئازاری دڵمان ناکەین. وە ئەو شتانەی دڵمان خوازیاری بوو، وەك بوکەڵە و ئۆتۆمبێلی بچووکی یاری کردن. مایەی ئارامی دڵ و دەروونمان بوون.

کاتێك دەگەین بەو سەردەم و قۆناغەی ئاوەز و تێفکرینمان گەشە دەکات، زێتر و زێتر هەستیار دەبین. هەستیار بوون بەرامبەر بەو کێشە و ئازارانەی پێمان دەدرێت. بەرامبەر ئەو سەختی و ناخۆشییانەی ژیان، کە بەربەستی سەرسوڕهێنەرت بۆ دروست دەکات.

(من، تۆ، ئێوە، ئێمە) سەرجەمی مرۆڤەکان لەم جەنگەی ژیان هەوڵی بەدەستهێنانی شادوومانی و بەختەوەریی رەها دەدەین. باشە، با ڕاستەوخۆ بپرسم: بەختەوەریی لای هەر یەکێکتان، وەك تاکێکی نێو کۆمەڵگە پارە و دەوڵەمەندییە؟ یان هاوسەری جوانە؟ یان بڕوانامەی بەرزە؟ یان ئەو حەز و ئاواتانەی لە دڵ و بیرتدا ماوەتەوە و نەتتوانیوە کرداریيەن بەرجەستەی بکەیت؟

وەرن، با بۆتانی روونبکەمەوە: بەبێ بوونی باوەڕێکی پاك و راستەقینە بەرامبەر پەروەرێنی زانا تێکڕای ئەمانە بۆ کاتێکی کەم، توانای دڵخۆشکردنی ئێوەی هەیە! دواتر چی؟ ئەمانەت دەست خست و بەختەوەر نەبوویت؟ چۆن لە خۆت ڕادەمێنی؟ پلانت چی دەبێت؟ بە دڵنیاییەوە بەبێ بوونی باوەڕێکی پاك و ڕاستەقینە بۆ هەمیشە توانای بەختەوەرییەکی ئارام بەخشت نابێت.

بیربکەرەوە، ڕەنگە هەژارێکی تەندروست باش بیت کە بازرگانێکی

دەوڵەمەند ئاوات بە تۆ بخوازێت، یاخود بڕوانامەیەکی نزمت هەبێت،

بەڵام خاوەن کارێکی نایاب و بەختەوەربیت وە دڵخۆشبیت بەو بڕە

پارەیەی کە بە وەڕسبوون و هیلاکی و ڕەنج کێشانی خۆت پەیدات

کردووە. بڕوانە ئەو کەسەی کە خاوەن بڕوانامەیەکی بەرزە، بەڵام ڕەنگە

تاکو ئێستا کارێکی نەبێت یاخود بە بوونی ئەو داهاتەی هەیەتی

دڵخۆش نەبێت (نموونەی ئەو جۆرە خەڵکانە زۆرن).

ڕەنگە خاوەن ڕوخسارێکی سەرنجڕاکێش نەبیت، بەڵام هەمیشە وا

هەست بکەیت جوانیت وە سەرنجڕاکێشیت. بەم هۆیەش ئاسودە

بیت، بەڵام مەرج نییە ئەوەی خاوەن ڕوخسارێکی سەرنجڕاکێش بێت،

ئاسودە بێت. ڕەنگە بۆ هەڵبژاردنی پۆشاکەکەی دوو دڵ و قەلەق بێت.

بڕوانە لەوانەیە لای خەڵك هاوسەرەکەت زۆر جوان و سەرنجڕاکێش نەبێت، بەڵام گرنگە تۆ ئەوت لاپەسند و جوان بێت. کێشەت لەگەڵ ڕەوشتیدا نەبێت و ئەو خاوەن کەسایەتییەکی گونجاو بێت.

مەرج نییە سەرجەم خولیا و ئامانجەکانت بەدەست بهێنیت و بگەیتە بەختەوەری. بە ئەگەرێکی زۆریش ئاواتە خوازی بەدیهێنانی گەلێك شتیت، بەڵام دەرفەتی گونجاو دروست نابێت بۆ بەدیهێنانی. دەبێت باوەڕمان بەوە هەبێت کە خودا لە چارەنووسی ئیمەیدا نووسیوەتەوە. باوەڕمان بەوە هەبێت کە هەموو ئەوانەی دێنە ڕێمان، لەلایەن پەروەردگارەوە بڕیاری لێدراوە.

خوازیاری ئەوەین مرۆڤی بەرامبەرمان، هاوچەشن و هاوڕەفتار و گوفتاری خۆمان بن. دڵێکی میهرەبان و خۆش ڕەفتاریان هەبێت، ڕاستگۆ و خاوەن ویژدان بن.

باش بیربکەنەوە، ئەو داواکاریانە ئاسانن؟ مەیدانیەن دەچەسپن؟

من پێتان دەڵێم: "بێگومان نەخێر"

ئێمەی مرۆڤ جیاوازین لە یەکتر، بە شێوە و جۆری جیاواز بیردەکەینەوە.

بۆچونی ترمان هەیە. خاوەن بیرۆکە و جیهانبینی جیاوازین لەیەکتر.

بێگومان هیچ یەکێك لە ئێمە ناتوانین ڕاستەوخۆ گۆڕانکاری بەسەر

بیرکردنەوە و ئایدۆلۆژیای بەرامبەردا بهێنین، بەڵام دەتوانین کاریگەری

لەسەریەکتر دروست بکەین. وە بۆ خۆشمان پێویستە سنور بۆ ژینمان

دابنێین، ئاکار و بیرکردنەوە خراپەکانمان بخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمان و

لە خزمەت کاری چاکەدا بین وە هەمیشە لە نێو کۆمەڵگە لە هەوڵی

پیشاندانی ڕەوشتە جوان و بەها باڵاکان بین و چاکەکردن لە پێشینەی

هەموو کارێکماندا بێت. ئەوەش بۆ ئەوەی چێژی بەختەوەری بدۆزینەوە

و لە کانیاوی سازگاری ژیان، تینوێتیمان بشکێنین.

تێکڕای مرۆڤەکانی ئەم جیهانە وێڵی دۆزینەوەی بەختەوەرین، باشە بەڕاست کامە بەختەوەری؟ ئەو خۆشیە بچوك و کاتییانەی ئێمە پێمان وایە بەختەوەرییە؟ دەمەوێت لەتۆی خوێنەر بپرسم: سەرچاوەی بەختەوەری ڕاستەقینە پێویستە لەکوێوە هەڵبقوڵێت؟ ڕەنگە ژمارەیەك ڕێگە بزانیت بۆ گەیشتن پێی، بەڵام دواجار دۆزینەوە و بەدەستهێنانی بەو چەشنە ئاسان نییە، کە بیری لێدەکەیتەوە.

لە ژیانم، وا بە ئاسانی نەگەیشتوومەتە بەختەوەری. سەرەتاکان، ئەو ڕێگەیانەی لە ئەندێشەم بوون، تاقیمکردەوە. بەشێکی زۆری ئەو شتانەی دڵم خوازیاری بوو بەدەستمهێنا. ئامانجێکی قۆناغی منداڵیم لە یادگە و ئاوەزم هەر مابوو، توانیم پێی بگەم. ڕوون پێتان بڵێم: هیچ یەکێك لەمانە کەشتییەکەمیان نەگەیاندە کەنارەکانی بەختەوەری و برێك جار بۆ کاتێکی دیاریکراو دڵم بە بەدەستهێنانیان خۆش دەبوو.

**دوای تێفکرین و بیرکردنەوە، دوای گوێگرتن لە خەڵك و خوێندنەوەی چەندین کتێب. بە هەوڵدان و نەسرەوتن سەرچاوەی ئەم بەختەوەرییەم دۆزیوەتەوە و شادوومانم و دەمەوێت چۆنیەتی گەیشتن پێی لەم گەشتەدا، لەگەڵ ئێوە بەشبکەم و بۆتانی روونبکەمەوە.**

**دەست بە گەشتەکەمان دەکەین...**

**بەخێربێیت بۆنێو جیهانی بەختەوەری ...**

**وردبوونەوە لە گومانەکان و شیکردنەوەی**

**بەرلەوەی سەرنجی گومانەکان بدەین و شیکردنەوەیان بۆ بکەین. با لە خۆمان رابمێنین! خۆمان بناسین. مەبەست لە بوونی ئێمە چییە؟ بۆچی پێمان دەوترێت ئادەمیزاد؟ ئامانج لەم دونیایە چییە؟ هەرگیز، سەبارەت بە پرسیارەکانی سەرەوە خەڵوەتت کردووە و ڕاماوییت؟ پرسیاری تر لەسەر بوونی خۆت، بوونی جیهان، هۆی ژیان، بەدیلی تر و پرسیاری تر...**

**باشە ئێستا رەنگە بێتە خەیاڵت، ئەرێ لەنێو ئەم جیهانە جەنجاڵەدا چی دەگوزەرێت؟ ئامانجی گەورە و پەیامی گەورەی ئەم جیهانە چییە؟ چۆن شیکردنەوەی بۆ بکەم؟!**

ئێستا پێشنیار دەکەم، وەڵامی سێ پرسیار بە کرداری لە درێژەی ڕەوتی ژیانتدا بدەیتەوە. قسە نا! کێشە گەورەکەی ئێمە ئەوەیە دەربرینمان زێدەترە لە کردارمان. ڕاستگۆبوون ئەو کاتە بەرجەستە دەبێت کە گوفتار و کردارمان ئاوێنەی یەك بن. باوەڕ لێرە ڕۆڵ دەبینێت، چونکە ڕاستگۆ نەبوونمان لەگەڵ پەیامەکەمان بەمانای خستنەڕوو و پەرشکردنی پڕوپاگەندەیە. باوەڕ، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بەختەوەریی هەمیشەییەوە هەیە. تاکو نەگەینە پلەی باوەڕداری، ناشگەین بە بەختەوەریی و سەرفرازی دنیا و دوارۆژ. بەختەوەری پەیوەستە بە ناخ و دەروون و چەشنەکانی بیرکردنەوەت بەرامبەر ڕەهەندەکان و کێشەکان و وێنە گەورەکەی گەردوون.

گومان، لێرەدا هۆکارە بۆ دووربوونت لە دڵخۆشی و بەدەستنەهێنانی، بۆیە تا ئەو ساتەی گومانداربین بەرامبەر ئاین و باوەڕمان ناگەینە

بەختەوەری، چێژ بەخش نابێت. بۆئەوەی بگەین بەو بەختەوەرییە، باشترین ڕێگە لەناوبردن و نەهێشتنی گومانەکانە، سەرنجدان و پێداچوونەوەیە بە ناخ و بیرکردنەوەمان. گومانەکان بە شیکردنەوە و خستنەرووی بەڵگە شەرعی و زانستییەکان کۆتاییان پێدێت. ئەوەی لەم تەوەرەدا دەخرێتە ڕوو: ئایەتەکاتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبە رمانە (د.خ) چونکە لەم بەڵگانە باشتر و بەهێزتر بوونی نییە لە جیهان.

هەرگیز نەکەن، پەلە بکەن لە دەربڕینی بۆچوونەکانتان. ئاڵۆز مەبن و خودی شتەکان سادە و ڕوونن. پرسیارەکان و گومانەکانت بخەرە نێو بازنەیەکەوە. ئامادەبن و سەرنج بدەن، بەیەکەوە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەینەوە، کە دەمێکە نیشتەجێی ئاوەزمانن. دۆزینەوەی چارەسەرییش

بۆ ئەو گومانانەی هاوسەنگی ژینیان بەلاڕێدا بردووین، زیانیان بە ئەقڵ و دەرونمان گەیاندووە.

ئەرکی ئەم تەوەرەیە چی دەبێت؟ پرسیاری یەکەم: تۆ کێیت؟

با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی مرۆڤایەتی، چۆن باوەڕ بەوە دەهێنیت کە ئێمەی ئادەمیزاد هەمووومان ئادەمین؟ یەکێك لە بەهێزترین بەڵگەکان سەبارەت بە دروستکردنی حەزرەتی ئادەم لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (آل عمران) ئایەتی (59) دایە. بەمشێوەیە:[ إِنَّ مَثَلَّ عِيسَ عنْدَّ الله كَمَثَلِ آدَمَ خَلقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُون]. واتا: "بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە؛ وەک نموونەی ئادەم وایە کە لە خاک دروستی کرد و لەوەو دوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو، (عیسا دایکی هەبوو، ئادەم دایک و باوکیشی نەبوو). (س: تەفسیری ئاسان)"

ئەگەر لە رووی زانستییەوە سەیری بەدیهێنان و دروستکردنی مرۆڤ بکەین، دەزانین کە هێلکە و تۆ دوو هۆکار و یەکەم هەنگاوی پرۆسەکەن. پرسیاری گرنگ ئەوەیە ئایا ئەم بابەتە شتێکی سادە و

ڕووکەشە؟ کێ لە پشت ئەم نمایشەیە و فەرماندەری خولقێنەرە؟

کۆنترۆڵکاری زانا و ئاگادار کێیە؟ لە کاتێکدا[ ٢٣ ] بیست و سێ تاك

کرۆمۆسۆم لە تۆوی پیاودا لەگەڵ [٢٣ ]بیست وسێ تاك کرۆمۆسۆم لە

هێلکەی ئافرەتدا یەکدەگرن و هێلکەی پیتراو درووست دەبێت، دواتر

لە ماوەی یەك هەفتە هێلکەی پییتراو گەشە دەکات و دەبێت بە

کۆرپەلە و لە منداڵدانی دایك بەردەوامی بە گەشەکەی دەدات.

سەروەرمان [ د.خ] دەفەرمووێت: تۆوی پیاو [ ٤٢ ] ڕۆژی بەسەردا

تێپەڕێت، خودای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت وێنەی دەکێشێت و

بیستن و بینینەکەی درووست دەکات وە پێست و گۆشت و

ئێسکەکانی. کەواتە لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چۆن هاتووینەتە

بوون. لێرەوە پێویستە وردتر سەرنج لەوتەوەرەیە بدەین و چڕتر بین:

نەخشەیەکی دروست و ڕێك كێشراوە. چی دەڵێیت ئەگەر ناتەواویەك لە هێلکەی ئافرەت یاخود تۆی پیاودا هەبێت؟ بێگومان کۆرپەلە دروست نابێت! تێکڕای زانا و داناکانی ئەم جیهانە پان و بەرینە لە هەوڵ و کۆششابن لە توانایاندا نییە ئەم ناتەواوییە چارەسەر بکەن. بۆیە هەموو ئەو کارە جوان و کۆنترۆڵکراوانە لەلایەن زانا و خولقێنەری بێ وێنەی زەوی و ڕێسمانی خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوور بەڕێوەدەبرێت.

گەشەی کۆرپەلە نۆ مانگی پێویستە دوای ئەم نۆ مانگە ئارامگەکەی جێدەهێڵێت و چاوەکانی بە دونیا ئاشنا دەبن. کە لە دایك دەبین، بە ئێمە دەڵێن: ئادەمیزاد یاخود بەنی ئادەم. ئێستا دووبارە دەپرسییتەوە: سەرسام بوومە، تێناگەم مرۆڤم یاخود ئادەمیزاد؟ هاورێ گیان، بە تەنیا بوونی دێڕێك بەسە بۆ وەڵامی پرسیارە کە : "هەموو ئادەمیزادێك مرۆڤە بەڵام هەموو مرۆڤێك ئادەمیزاد نییە" ئێمە لە رووی جەستەو شێوەو بوونمان مرۆڤین، بەڵام ئادەمیزاد ئەوەیە کە لە ژێر فەرمانەکانی خودای پاك و دەسەڵاتدارە و فەرمان شکێنی ناکات. هەموومان مرۆڤین، بەڵام مەرج نییە هەموومان ئادەمیزاد بین. هەر بۆیە دەکرێت لە

ڕێگەی ڕاستی دووربکەوینەوە. بە ئاکارە خراپەکان و نیەتە خراپەکان شەیتان بمانخەڵەتێنێت، ئەوکات تەنیا شت کە پێمان بگوترێ وشەی (مرۆڤ)ە. کەواتە دەکرێت ئێمە تاکە بوونەوەر بین کە خودا بەرزی ڕاگرتووین وە ڕێزی لێ گرتووین. ئایا خودایەك ئەم هەموو بەخششە بە ئێمە بدات، شیاوی پەرستن نییە؟ بڕیاربدە، کە دەبیت بە ئادەمیزاد، یاخود هەر پەیڤی مرۆڤەکە بەسە بۆ تۆ!

پرسیاری دووەم: ئامانجت چییە لە ژیان؟

بەخێرایی و بەر لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، گرنگە بپرسم: مەبەست لە بوونی ئێمە چییە؟ بۆچی خودای گەورە ئەم هەموو ڕێزەی داوە بە ئادەمیزاد؟ ئایا لە چ کاتێکدا ئێمە شایانی ئەم هەموو ڕێزو بەخششە زۆرە دەبین؟ بوونی ئێمەی ئادەمیزاد لەم زەویەدا بەخششێکی خودای گەورەیە. خودای گەورە ڕاستەوخۆ دەیتوانی ئێمە بۆ بەهەشت ببات،

بەڵام پێویستە ورد  ببینەوە مەبەست لە بوونی ئێمە چییە لەسەر زەوی؟

خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت:

" يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ" الحجرات

واتا: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك بەدیهێنا، کردوومانن بە گەل و هۆزی جۆرا و جۆر بۆئەوەی یەکتر بناسن و بە گیانێکی برایانە مامەڵە، لەگەڵ یەکدیدا بکەن.

ئەگەر لەم ئایەتەوە سەرنج بدەین، پەروەرێن فێری ژمارەیەك وانەی ژیانمان دەکات، وەك: هەوڵدان، کۆڵنەدان، ئارامگرتن، ڕێزگرتن، پێکەوەبوون، هاوکاری کردن، ژیانکردن، هەست و سۆز، سەرکەوتن، تاقیکردنەوە، ڕێزگرتن لە کات، ماندوبوون، خێزان، مرۆڤایەتی، زیرەکی،

گەڕان، بیرکردنەوە، سەرنج و تێڕامان، هاوبەشی، پەیوەندییەکان، فێربوون هتد...

ئەمانە مشتێکن لە خەرمانی فێربوونی وانەکانی ژیان لە قورئانی پیرۆزەوە. هەرگیز وا بیرمەکەنەوە کە ژیان تەنیا (خواردن و خۆشی و تەندروستی باش و چێژ وەرگرتن) بێت. بەڵکوو پێویستە لەم جیهانە فراوانەدا بەسەر سەختییەکان زاڵ بین. خولقێنەر بەندەی وەك ئێمە تاقیدەکاتەوە، مەرجییش نییە تەنیا بە کارەسات و ناخۆشییەکان بێت، بەڵکو دەشێت بە سەرکەوتن و خۆشی و پێکەنینەکانمان بێت. ڕوانینی زۆرینەی خەڵك بۆ ژیان، پەرستشی بەردەوام و دوورکەوتنەوە لە شادییە هتد... بەشێکییش لەمانە وا دەزانن ژیان تەنیا بریتییە لە هەست و ئارەزوو و حەزەکان، یاخود هەر یەک لەو شتانەی مرۆڤ حەزی

پێدەکات ئەنجامی بدات بێ گومان ئەو بیرکردنەوانە دروست نیین وە

هاودید نیم لەگەڵیاندا.

پەروەردگار پێمانی فەرمووە: پێویستە لە ژیانییش چێژ و خۆشی وەربگرین. پێموایە نایابترین چێژ وەرگرتن لە ژیان و خۆشتریینی ئەوەیە کە ڕێگەی قیامەت لەپێناو بەدەستهێنانی ژیانی ڕەهایی بگریتەبەر. کە چێژێکی بێ کۆتایی و خۆشییەکی دەرنەبڕدراوە بە زاری دەم. هەمووتان هان دەدەم ئەو ڕێگەیە بگرنە بەر بۆ تێگەیشتنێکی واقیع بینانەتر لە مانا و چەمکی ژیان. دواجار گەیشتن بەو بەختەوەرییەی کە هەموومان پێویستمان پێیەتی. گرنگە تاکۆتایی ئەم کتێبە لەگەڵمدا بن، بۆئەوەی بە وردی ڕێگەکانتان بۆ دەستنیشان بکەم. ڕەنگە دواجار ئێوەش بڕیاری دەستپێکردن بەو ڕێگەیە بدەن، کە تاکو ئێستا نەتانگرتووەتە بەر.

سەبارەت بە گومانەکان، ژمارەیەک بۆچوون هەیە، کە دەڵێت: ئەگەر خودای گەورە دەسەڵاتێکی ئەوەندە بەهێزی هەیە ئەی بۆچی بە (کن فیکون) ئاسمانەکان و زەوی دروست نەکرد؟ یەکێک لە بەڵگەکانی تر ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە تیایدا خودای گەورە فەرموویەتی:" إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَ اسْتَوَى الْعَرشِ

يُدَبِّرُ الأَمْرَ مَا مِنَّ شَفِيعٍ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ إِذْنِهِ ذَلِكُمُ اللهُ رَبُّكُم فَاعْبُدُوهُ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ "سورة يونس ئايه تى٣ . واتا :به ڕاستى پەروەردگارى ئێوه [الله]يه،ئەو زاتەيه كه ئاسمانه كان و زەوى له شەش ڕۆژدا دروست كردووه له وەودوا لەسەر تەختى فەرمانڕەوايى وەستا هەڵبەته چۆنيەتى وەستان و گه لێ شتى لەو بابەتانه له رادەى بۆچونى ئێمه دا نييه، تەفسيرى ئەم ئايەتەيان له پێشەوا ماليك وئەحمەد پرسيووه، له وەڵامدا وتوويانه: وەستانه كه حەقيقەتى هەيه،چۆنيەتيەكەى شاراوەيه، پرسياركردن دەربارەى بيدعەيه، باوەڕ بوون پێى واجبه. وەک باسكراوه تەنيا خودا دەزانێت ئەو ڕۆژانه درێژى ماوەكەيان چەندە. بەهۆى ئەوەى ڕۆژەكانى لاى ئێمه جيايه، لەگەڵ ڕۆژەكانى لاى خوداى گەوره.

وەرن رابمێنين: پەروەردگار، دەيتوانى به يەک (كن فيكون) تەواوى گه ردوون دروست بكات، وەلێ چاک دەزانين دەسەڵاتى پەروەردگار زۆر لەوە باڵاتره كه ئێمه پەى پێ دەبەين و بيرى لێ دەكەينەوە. هەر بۆيەشه گەردوونێكى پڕ له وردەكارى و نهێنى جۆراو جۆر به چەندين ڕێگه، كه ئاوەزى مرۆڤ له ئاستيى بێ توانايه، داڕشتووه و بنيادى ناوه.

دواى ئەوەى، ئاسمان و ڕێسمان و زەوى و خۆر و مانگ، ئەستێره و هەسارەكانى ترى بەديهێنا. ئينجا زنجيره شاخەكانى جێگيركرد، تاوەكو

زەوی جێگیری بکات. وە زەوییش کۆنترۆڵی لەدەست نەدات، گرنگە تێبفکرین کە سێ یەکی زەوی لە ئاو پێکدێت. ئاژەڵ و ڕووەک و ماددەکان و خۆڵ و هتد... هەموو ئەمانەی لەپێناو مرۆڤدا هێنایە بوون.

ئێستا کات گونجاوە بۆئەوەی گومانێکی تر، بخەمە بەر باس و قسەی تێدا بکەم. ئەگەر لە شەوی [ ٤٢ ]ی کۆرپەلە خودای گەورە بڕیار لەسەر تەواوی ژیان و داهاتووی مرۆڤەکە بدات، کەواتە: ئێمە چۆن بتوانین، گۆڕانکاری لە ئاییندەی خۆمان بکەین؟ لە کاتێکدا پەروەرێن لە توانایدا هەیە  بڕیار و قەڵەم لە ڕۆژەکانی پشوودان و هەناسەدان و تێکۆشان و نەوەستانی ژینی ئێمە بدات.

تاکە شت کە جێگەی یەقین و بڕوایە ئەوەیە، کە خودا فەرموویەتی: پێیان بڵێ، هەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگار تا ئەوە بۆشایی ڕەوانە کراوە ئینجا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت ئەوەشی دەیەوێت با کافر و بێ باوەڕ بێت. بێگومان بن لەوەی ئێمە دۆزەخێکمان ئامادەکردووە بۆ ستەمکاران کە لەهەموو لایەکەوە دەوریان دەدات دیواری بڵێسە ئابڵوقەی داون. خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئازار و تینوێتیی ئاو دەدرێن بە ئاوێکی گەرمی پیسی و بۆن ناخۆشی، کە وەکو خڵتەی کانزایی تواوە وایە. ئەوەندەش گەرمە ڕوخساریان هەڵدەکوڕمێ. تینووتە

و دەیپرژێنن، ئای کە چەند خواردنەوەیەکی تاڵ و ناخۆشە. چەندە جێگری ڕێگەیەکی پڕ لە ئازارە.

لێرەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە، کە خودای گەورە مرۆڤی ئازاد کردووە لەوەی ڕێگای ڕاستی یان خراپی هەڵدەبژێرێت. کەواتە دواجار ئەوە مروڤە بڕیار لە هەڵبژاردنی ڕێگەی ژیان و چارەنووسی خۆی دەدات، بەڵام پاداشت و سزاکەی لای خودای بەتوانا و باڵادەست و پاک و بێگەردە.

هەست دەکەم، چارەسەرمان بۆ بەشێکی گومانەکان دۆزیبێتەوە بۆیە پێویستە لەخۆت بپرسیت چۆن دەتوانیت بڕیار لەسەر ژیانت بدەیت؟ وە بۆ دەیدەیت؟ ئامانجی باڵات لەوەدا چییە؟ چی تر هەیە جێگەی پرسیار و گومان؟ پەلە مەکە هاوڕێ. بە پرسیارێک دەمەوێت چارەسەری تەواوی گومانەکان بکەین، ئەویش: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بیربکەوە، دوای ئەوەی دڵنیا بوویت لەکوێوە هاتوویت؟ ئامانجت چییە؟ بۆکوێ دەڕۆیت؟

گومانم لەوەدا نییە، کە هەمووومان دڵنیایین مردن هەیە. هەڵبەتە تەنیا باوەڕبوونمان بە مردن بەس نییە، تاکو گومانەکان کۆتاییان بێت. زێتر، ئەو مرۆڤانەی خاوەن باوەڕێکی لاوازن، توانای ئەوەیان نییە بڕوا بە جیهانێکی تر و ژیانێکی تر بهێنن، کە تیایدا لێپرسیینەوە، پاداشت و

سزا هەیە. ئەگەر بەڕاستی باوەڕ بە جیهان و ژیانێکی تر بهێنین، زۆر زێتر لە ئێستەمان دڵنیا و شادوومان دەبوین لە هەڵبژاردنی ئامانجەکانمان، وە بەدەستهێنان و جێبەجێکردنی پلانەکانمان.

خودا دەیەوێت دروستکراوەکانی خۆی تاقیبکاتەوە، بۆیە مرۆڤی ژیر و عاقڵ هەست بەو بەرپرسیارێتیە دەکات دەشزانێت هیچ تاقیکردنەوەیەک بێ ئەنجام نابێت.

پەروەردگار، لە یەکێک لە ئایەتەکان دەفەرمووێت: [إِلَيهِ مَرْجِعُكُم جَمِعًا وَعدَ اللهِ حَقًّا إِنَّهُ يَبْدَأُ الخلق ثُمَّ يُعِيدَهُ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصلِحاتِ بِلْقِسطِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُم شَراب مِنْ حَمِيمٍ وَعَذَاب أَلِيم بِمَا كَانُوا يكْفُرُنَ] (سورة يونس – ئایەتی٤) واتا: گەڕانەوەی هەر هەمووتان بۆ لای ئەو زاتەیە، بەڵێنی خوا هەمیشە ڕاستەو دروستە و نەگۆڕە، بەڕاستی خودا سەرەتا دروست کراوان بەدی دەهێنێت و دواییش وەک خۆیان لێدەکاتەوە، تا لەقیامەت ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بە دادپەروەریی پاداشتیان بداتەوە، ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون خواردنەوەی لەکوڵ و سزای بەئێش و ئازارییان بۆ ئامادەیە بەهۆی ئەوەی کەباوەڕیان نەدەهێنا.

دووباره باسەرنج بدەین و تێڕابمێنین: بەشێک لەو بەڵگانەی لەبارەیەوە دواین ئەوەیە، کە پەروەرێن هەمیشە جەختی لە پاداشت و سزا کردۆتەوە لەسەر کردەوەکانمان. بۆیە دەگەین بەو سەرەنجامە کە جیهانێکی تر و فراوان بۆ لێپرسینەوە کە لەلایەن خالقی ئەم گەردوونە ئامادەکراوە بوونی هەیە.

ئەریٚ ئێستا چی؟ باوەڕ دەهێنیت؟ هیچ گومانێکت لە دڵ ماوە؟ دوای ئەوەی زۆرینەی پرسیار و گومانە سەرەکی و دینگەکانی باوەڕمان بۆ شەن و کەو کردن.

ئەمەش ڕوونە، کە هەر یەکێک لە ئێمەی مرۆڤ، بۆئەوەی بەردەوامی بە ژیانی خۆمان بدەین ڕێڕەو بەردەوام بێت لە جوڵە، بۆ نەوەکانی دوای خۆشمان پێویستە ئەو ئەرک و کارانەی کە بۆ ژیانکردن پێویستن ئەنجامییان بدەین وە گرنگتر لەوە کات بەڕێکردن لەم ژیانەدا بەبێ بوونی باوەڕ هیچ بە مرۆڤ نابەخشێت. بە تایبەت گومانەکان بۆیە لە ژیان وردتر تێڕامان بۆ شتەکان بکە هەوڵیشبدە چارەسەری گومانەکانییش بدۆزییتەوە.

سیاسەتی ژیان بەمشێوەیەیە: (ژیان=باوەڕ) "گومانەکان دژی باوەڕن" گومان هەستێکی نەرێنی لە مرۆڤدا دروست دەکات. بەمەش مرۆڤ

ناتوانێت باوەڕ بهێنێت، زۆر گرنگە جگە لە ئەرکە ئاینییەکان، وەک نوێژ، ڕۆژوو، پەرستش، زەکات، حەج، بەخشین، چاکەکردن هتد..

لەگەڵ کاری ڕۆژانە پێویستە جوڵە ئەنجام بدەین بۆ چالاکی و زیاتر پڕ بەرهەمی خۆمان (کارکردن بۆ بژێوی ژیان، پەروەردەکردنی منداڵ، پەیوەندییە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان، جێبەجێکردنی پلانەکانی ژیان، بەدیهێنانی ئامانجەکان هتد...) تۆ کە بڕیارتداوە ناسناوی ئادەمیزاد چنگ خەیت پێویستە ئەرکە ئاینییەکان و ئەرکەکانی ژیان ئەنجام بدەیت، با بپرسم: تا ئێستا خاوەنی ئەم هەستە بوویت، کە لە پەرستشی خولقێنەر نوقم بووبیت. زیکر و نزا هۆشیان لێ دزی بی و لە عەشقی ئیلاهی سەرمەست بووبیت. خۆت بڕیار بدە، چەند دڵخۆش بوویت؟ ئارامی و مەعنەویەتی بەرز چۆن باڵی بەسەر کێشابوویت؟ گەر تاکو ئێستا تاقیت نەکردۆتەوە، دەست پێبکە. بڕۆرە نێو کەشێکی زیکر و پەرستشی خالق، هەست بە ئارامی و چێژ وەرگرتن بکە لە ژیان. دڵنیاتان دەکەمەوە ژیانکردن بێ ئەم هەستە، بێزارکەر و وەرسکەر و بێ بۆن و ڕەنگ و هەست و ڕۆتینێکی ناخۆش و شتێکی بێ مانا دەبێت. بۆ ئەمە هەمیشە وتوومە: "گرنگ نییە، لە چ کات و شوێنێکی گرنگ

خۆشەویستی خودا لە دڵت بێت و تۆوی چاکە بچێنیت" بەڵکو ئامانجی دوارۆژ بەدیبێنیت.

مەبەست لە ئامانجی دوارۆژ ئەو شوێنەیە، کە گشت ئادەمیزاد ئاواتی پێ دەخوازێت. ئەو ئاواتەش بەهەشتە. ئەو بەهەشتەی ژینکردن تێیدا بێ کۆتاییە. بۆ ئەو باوەڕدارانەی خاوەن چاکە و کاری باش و پەرستشن ئامادە کراوە. بۆیە هەوڵبدەن بەختەوەری بدۆزنەوە و بەهەشتی ناکۆتا بەدەست بهێنن.

**چیرۆکی سەعید زیاد...**

لەزاری خۆیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: دەستپێکی گەنجیم بوو، لەوڵاتی مەغریب دادەنیشتین، ماڵمان بەرامبەر کەناڵی مەغریب بوو. لەو کەناڵە خول و کۆرسی فێربوونیان بۆ (شانۆ، مۆسیقا، بەشی هونەری تر) کردبوویەوە، وەکو هاوڕێکانم زۆرم حەزدەکرد بەشداری بکەم بە مەبەستی دەستخستن و پەیداکردنی ناوبانگ. کات گوزەری کرد و لەوێدا وەرگیرام. بەرنامەیەکی رادیۆییان پێدام، ڕۆژانە پێشکەشم دەکرد. ڕۆژێك لەنێو بەرنامەکەمدا گۆرانییەکم گوت، دواتر خەڵك پەیوەندییان پێوەکردم و دەستخۆشی و پێزانینیان بۆم هەبوو. داوای بوون بەهونەرمەند رۆژانە دووبارە دەبوویەوە لەلایەن گوێگرانی بەرنامەکەم. ئەم بیرۆکەیە لام گەشەی سەند و بووم بەگۆرانی بێژ. ناوبانگم دەست خست و پلەم بەرز بوویەوە، بەچەشنێك پەیوەندییم لەگەڵ سەرۆکوەزیران گەرم و باش بوو، ڕۆژانە سەردانیم دەکرد، گەلێك شەو لای ئەو داوەت بووم.

کات تێپەڕی و هەستم بەدڵتەنگی و نائاسوودەیی دەکرد. دەمویست شتی ون بدۆزمەوە، هەستێکی نامۆم هەبوو. بیرم کردەوە: بەشداری لەفیلم بکەم. پێموابوو، کاری فیلم بەختەوەرم دەکات، بەهۆی ئەوەی

فیلم کۆمیدیا و سینەماییە، کارەکتەرەکان هەمیشە دڵخۆشن.. لە فیلمێك بەشدارییم کرد و ڕۆڵی سەرەکییان پێ بەخشیم. ناوداریيم، زیاتر بوو. خەڵکان دەهاتن و گفتوگۆی چڕیان لەگەڵ دەکردم.

لەساڵی'١٩٧٧' زۆر بێ توانا بووم. هەستی نائاسوودەییم زیاتر بوو. ڕۆژێك یەکێك لە رۆژنامەنووسەکان، بەناوی[ ابوشوعیب نضر ]قسەی لەگەڵ کردم. دوای گفتووگۆ، پرسیارێکی گەلێك سەیر و نامۆی لێکردم. وتی: سەعید، تۆ وەك ناوەکەت بەختەوەرییت. نەختێك وەستام، دواتر وڵامم دایەوە و وتم: من (س، ع، ی، د) سەعی واتا هەوڵدان و تێکۆشان، بۆئەوەی (د) بدۆزمەوە کە بەختەوەرییە. هەر کە (د)م دۆزییەوە پەیوەندییت پێوە دەکەم. ماوەیەك چووم بۆ دەرەوەی وڵات بەڵام نائاسوودە بووم. هەستم کرد، تەنیا شوێنی جوگرافیام گۆڕیوە. بەپەلە گەڕامەوە بۆ وڵاتی مەغریب.

لەهەمان ساڵ (عبدالحلیم حافض) زۆر هاوڕێی خۆشەویستم بوو، کۆچی دوایی کرد. بیرم کردەوە وتم: سەعید، ئەوپەڕی ناوبانگ دەست خەیت هاوچەشنی (عبدالحلیم حافض) ناودار دەبییت. باشە ئەمانە بۆچی دڵییان خۆش نییە؟ تۆ بەنیازی چییت؟ بەدوای چی

دەگەڕێیت؟.. بەردەوام و بەردەوام بیرم دەکردەوە، نەمدەزانی چۆن بگەم بە بەختەوەری!

لەکاتی پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی راستەوخۆ، وتم: هەرکەسێك پێناسە و واتای بەختەوەرییم بۆ بهێنێت، من خەڵاتی گەورەی پێدەدەم. وای لێهات، ڕۆژانە خەڵکێکی زۆر پەیوەندییان دەکرد، بەجۆر و شێوازی تر پێناسەیان دەکرد. هەموو ئەو پێناسە و دیدگایانە لای من، خۆشی کاتی بوون. بەردەوام نەبوون، بەڵکوو من بەدوای بەختەوەرییەکی بەردەوام و تایبەت و جیاواز دەگەڕام، کە هەمیشە و هەمیشە لام بێت.

برایەکەم، کە مسوڵمان نەبوو ڕۆژێك بەهۆی سەردانی کۆمەڵێك بانگخوازەوە لەهۆڵەندا بڕیاری بوون بە مسوڵمانێتی دەدات. هەمان ئەو بانگخوازانە، لە هۆڵەنداوە سەردانی منیان کرد لە مەغریب. کاتیك دەرگام لێ کردنەوە، هەر زوو پێم وتن: ئێوەم خۆشناوێت، چونکە ڕیشتان داناوە. وتیان: بۆ سەلام هاتووین. وتم: فەرموون، ئەوە سەلام و ئەحواڵ پرسین. چی ترتان لێم دەوێ؟ وتیان: بیستوومانە تۆ گۆرانی دەڵێیت؟ وتم: بەڵێ، ئەی ئێوە چی دەزانن؟ بانگخوازەکان سرودێکیان وت، زیاتر تێکەڵ بوون لەگەڵ سەعید، دواتر وتیان: بەڕوخسەتت ئێمە دەڕۆین! وتم: بۆ کوێ؟ وتیان: بەرەو مزگەوت ڕێ دەبڕیین، وانەمان

هەیە. پێم وتن: دەمەوێ لەگەڵتان بێم. هەستم کرد ئەوانیش لایان خۆشە و هەواڵەکە بۆ ئەوان شادی هێنە. دواتر بەئەهلی مزگەوتیان گوت: ئێمە ئەمشەو دەمێنینەوە، هەرکەسێکیش ئارەزووی هەیە دەتوانێت بمێنێتەوە. گوتم: منیش ئەمشەو دەمێنمەوە. هیچ کات هەستم بەم دڵخۆشییەی ئێستا نەکردووە بۆیە شەوەکە لەوێ ماینەوە و دواتر خەوتین.

درەنگی شەو خەبەرم بوویەوە، بینیم ئەوان بۆمن دەپاڕێنەوە. بەدەم گریانەوە دەڵێن: خودایە سەعید دزەییات هیدایەت بدە. لەدڵی خۆم وتم: سەیربکە، ئەمانە هاوەڵ و ناسیاوم نین، کەچی بۆمن دەپاڕێنەوە! پەرۆشی منن. چووم بۆ لایان پرسیم: بۆچی بۆ من دەپاڕێنەوە؟ لە وڵامدا گوتیان: ئاخر بەرەو دۆزەخ ڕێدەکەیت! بیرم کردەوەو وتم: ئەی خودایە، ئاخر ئەمەیە بەختەوەری! ئەوەی من بەدوایدا سەرگەردانم ئەمەیە ئەمە.

دوای ماوەیەك، بەسەردانێك گەیشتمە هۆڵەندا لای براکەم. مسوڵمانان لە دەورم کۆبوونەوە. زۆر دڵخۆش و بەختەوەر بووم. تا فێری (زانستی شەرعی بووم) نزیك سێ ساڵ و نیو مامەوە، ڕۆژێك نامەیەکم نارد بۆ ڕۆژنامەنووسەکە گوتم: موژدەبێت (د)م دۆزییەوە.. (سەعی) بوو بە

**(سەعید). (د) بۆمن بوو بە دەعوە و دین، سوپاسی پەروەرێن دەکەم هەردووکیانم دۆزییەوە.**

## [هەوڵدان لەپێناو دەستکەوتنی زانست و زانیاری]

سروشتی مرۆڤ لەوکاتەی دێتە بوون تاکوماڵئاوایی لەم جیهانە دەکات، هەمیشە ناکاملی لەژیانیدا هەیە. مرۆڤی باوەڕدارهەمیشە هەوڵدەدات، کەلێنەکانی ژیانی پڕ بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەش هیچ مرۆڤێك ناتوانێت کامڵ بێت، بەبڕوای من ئەگەر توانا و هەوڵدانی ئادەمیزاد لەو ئاستە بوایە کە تەواوی کەلێنەکانی ژیانی پڕکردبایەوە ئەوکات ئامانجەکان و هیواکان زوو کۆتاییان دەهات. لەبەرئەوەی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەوڵدەدات. کەواتە دەتوانین بڵێین ئامانجەکان بنچینەی هێز و تێکۆشانی مرۆڤە بۆ مانەوەی لەم جیهانەدا. بێگومان ناکاملی مرۆڤ لەڕووی ژیان ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە. هەمیشە بۆشاییەکی بەتاڵ هەیە لە زانستی ژیاندا. بۆیە ناکاملی مرۆڤ پەیوەستە بە زانستی ژیان. لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە چۆن بتوانین بۆشایی و کەلێنەکانی ژیان پڕ بکەینەوە؟ ئادەمیزاد لە توانایدا هەیە زۆربەی کەلێنەکانی ژیان پڕ بکاتەوە ئەویش لەڕێگەی هەوڵدان بۆ دەستکەوتنی زانستی ژیان. وردبوونەوە و تێڕامان و بیرکردنەوە لەم جیهانە گەورەیەدا. بیربکەوە ئەوکاتەی هاتیە دونیاوە تەنیا جەستەیەك بووی هیچت لەبارەی ژیانەوە نەدەزانی، بەڵام هەر ئەو جەستە بچوکە

لەدوای هەر چرکەساتێك هەوڵیداوە. تائەوکاتەی پێیەکانی ئەرزییان گرت، زمانی کەوتە قسەکردن، وازی لەشیری دایك هێنا و دەستی کرد بە خواردن دواتر یاریکردن وهەست کردن بە شتەکانی دەورووبەر، ڕەفتار کردن لە چوارچێوەی پەروەردەی خێزان دواتر چوون بۆ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی وزانکۆ، تێکەڵبوون لەگەڵ کۆمەڵگا و ناسینیی مرۆڤی باش و خراپ چەشتنی ئازارەکان وکۆڵنەدان وڕۆشتن بەرەو ئامانجەکان. ئەمانە و چەندەهای تر زۆرینەی کەلێنەکانی ژیانتی پرکردۆتەوە بیربکەوە چۆن ئەمانەت زانی؟ بێگومان سەرچاوەی هەموو ئەوانە هەوڵدان و فێربوونە ئەی باشە ئێمە چۆن لە بنەڕەتێکی بەتاڵ فێری هەموو ئەوانە بوین؟ بێگومان بە وەرگرتنی زانیارییەکان و گەران بەدوای زانستی ژیان دەبێتە هۆی زیاتر کامڵ بوونی مرۆڤ و پڕ بوونەوەی کەلێنەکانی ژیانی، وەك ئەوەی هەمیشە دەڵێن : [زانست رووناکی ژیانە ] ئەگەر ئاوڕێك لە سەدەکانی پێش خۆمان بدەینەوە ئاشکرایە کە بەهۆی زانست چ گۆڕانکارییەك بەسەر ئەم جیهانەدا هاتووە، نابێت ئەو ڕاستیەش بشارینەوە کە زانست پێویستی بە هەوڵدانە ئەم گەردوونە ئەوەندە فراوان و قوڵە بۆیە لەگەڵ بەردەوامی هەوڵەکانمان بۆ پڕ کردنەوەی بۆشایی ژیان کەچی زۆر شت هەن کە ئەستەمە مرۆڤ بگات بە ئەنجامەکەی ، هەندێ نهێنی هەن تەنها خودا خۆی پێیان

دەزانێت نموونە زۆربەی پێوانەی شتەکانی گەردوون ڕێژەکەی دەکاتە [١.٦١٨] ئەمە نهێنییە تەنها خودای گەورە هۆکارەکەی دەزانێت بەڵام کێ ئەم ڕێژەیەی دۆزییەوە؟ بێگومان مرۆڤ لەڕێگەی هەوڵدانی بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیان تاوەکو زیاتر لە بوونی ژیان و مرۆڤایەتی تێبگەین ئەو مرۆڤانەی تینووی زانستن هەوڵدەدەن تاوەکو بچنە قووڵایی زانست بۆیە زیاتر هەست بە کەلێن و بۆشاییەکانی گەردوون دەکەن خودای بەخشندە توانای زیرەکی بە مرۆڤ داوە بۆیە دەبێت بگەڕێین بەدوای زیرەکی خۆمان مەرج نیە زیرەکی تۆ دروستکردنی ئامێرێکی ئەلیکترۆنی بێت لەوانەیە دۆزینەوەی نهێنیەك بێت لەم جیهانە گەورەیە، گەورەترین مەترسی ئەو کاتە دێتە ئاراوە کەوا بیربکەینەوە لەناو سیستەمێکی هەمیشەیی و داخراو داین ئەستەمە بتوانین گۆڕانکارییەکی تێدا بکەین ئەوەش وا دەکات هەوڵنەدەین تاوەکو گۆڕانکاری لە ژیانتدا ڕووبدات وە نەگەڕێین بەدوای نهێنیە شاراوەکاندا بەمەش جیهان ناتوانێت بەرەو پێش بڕوات تەواوی کەون و کائینات پڕا و پڕە لەنهێنی وە شتانێك کە لە توانای ئێمەی مرۆڤدا نیە.

بە چاو بیان بینین خودای گەورە توانای زیرەکی و بیرکردنەوە و سەرنج و تێڕامانی داوە بە ئێمەی مرۆڤ تاوەکو بەدوای زانستی ژیاندا بگەڕێین و

زیاتر کامڵ بین و  زیاتر لە مانای بوونی جیهان بزانین و زیاتر هەست بە گەورەیی و دەسەڵات وهێزی پەروەردگار بکەین ئایا گازەکانی بەرگە هەوا وەك نایترۆجین، ئۆکسجین، هایدرۆجین هتد.. دەتوانین بەچاو بیان بینین ؟ بێگومان نەخێر لەگەڵ ئەوەشدا  توانیمان هەست  بە بوونیان بکەین وە سوودەکانیان دیاری بکەین وە ڕێژەکانیان هەموو ئەوانە بە هەوڵدان بوو کەواتە بە هەوڵدان دەتوانین ئەو شتە بدۆزیینەوە کە بەدوایدا دەگەڕێین هەندێ جار بەدوای شتێکدا دەگەڕێین کۆمەڵێك شتی دی دەدۆزیینەوە یەکێك لە وتە بە نرخەکانی ' سۆفۆکلیس ' دەڵێت: [سەرکەوتنم لەسەر هەوڵدان وەستاوە] بۆیە بە هەوڵدان زۆر شت دێتە بوون.

لە سەدەکانی رابردوودا مرۆڤ لە ژیانێکی سادە و ساکاردا ژیاوە تەنها لە خەمی پەیداکردنی بژێوی ژیانی بووە، ئەوەش وای کردووە گرنگی بە خوێندن نەدرێت، سەرەنجام داهێنان کەم بووە بەڵام سوپاس بۆ خودا لەم سەردەمەدا جیهان پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینییەوە زانست زیاتر گە شە ی کرد و داهێنان زۆر بووە ئەزیزم،

بیربکەوە ئەوانەی هەوڵدەدەن دەخوێنن داهێنان دەکەن وەك ئێمە مرۆڤن بۆ مەگەر ئێمە چیمان  لەوان کەمترە ؟

بێگومان جیاوازی ئەوان و ئێمە تەنها هەوڵدانە هەنگاونانە وە کۆڵنەدانە..
ئەگەر هەموو ئێمەی ئادەمیزاد بمانەوێت دەتوانیین ئەم جیهانە بگۆڕین
تەنها بە پێشکەوتنی زانست ئەوەی زانستیش سەردەخات هەر ئێمەین،
ئەوەشمان بیرنەچێت خودای گەورە ئەو مرۆڤانەی خۆش دەوێت کە
هەوڵدەدەن و دەگەڕێن بەدوای زانست و زانیاری ونهێنییەکانی ژیان
تاوەکو زیاتر لە بوونی ژیان و مرۆڤایەتی تێبگەین. ژیانی جاران زۆر سادە
و ساکار بووە هیچ کام لە ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانی وەك مۆبایل
تەلەفیزیۆن جل شۆر و بەفرگر و قاپ شۆر و ئامێرە پزیشکییەکان و
هتد...بوونیان نەبووە.

ئالێرەدا دەپرسم ئەوانە چۆن دۆزرانەوە؟ بێگومان بە هەوڵەکانی ئێمەی
مرۆڤ..

لێرەدا توانا و دەسەڵاتی خودای پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت. بۆیە با
ئەو هەوڵانەی لە ژیاندا دەیدەین لەپێناو وەرگرتنی زانست و زانیاریی
بێت ئێمە شتەکان زۆر بە سادەیی دەبینین بەڵام ئەگەر هاتوو لێیان
بکۆڵیینەوە و شییان بکەینەوە ئەوا دەبینین خودای پەروەردگار بچوکترین
شتی ئەم گەردوونە بە دەوڵەمەندی وە بێ حیکمەت بەدی نە هێناوە با
تەنها بەنموونەیەکی سادە بخەینە ڕوو: سێو یەکێکە لە میوەکان ئێمە

ڕۆژانە پێویستمانە بۆ تەندروستیی جەستەمان ئەگەر لێمان بپرسن سێو چۆن درووست بووە؟ وە سوودی چییە؟ ئێمە بە سادەیی وەڵام دەدەینەوە دەڵێین: درەختی سێو گەشەدەکات، سێو بەرهەم دێنێت.. (ڤیتامین سی C)ی تێدایە باشە ئەمە ڕاستە بەڵام ئایا سوودی ئەم ڤیتامینە چییە؟ وە چۆن ئەم ڤیتامینە لەناو ناچێت؟ زانست و لێکۆڵینەوەکان پێمان دەڵێن: کە ڤیتامینەکانی تەنها سێوێك بەشی پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژێکی مرۆڤێك دەکات. سێو هەم (ڤیتامین سی C) و هەم کانزای ئاسنی تێدایە ئەگەر ئاسنەکە نەبێت، دوای ماوەیەك ڤیتامینەکە دەگەنێت. لەلایەکی ترەوە سێو ڕێژەیەکی زۆر لە ترشی تێدایە. کە بەرپرسە لە پاراستنی ڤیتامینەکە بەمەش ترشی گەدە زیاد دەکات و زیان بە بەرگی ناوەوە دەگەیەنێت لەبەرئەوە ئایۆنی کاربۆن کراوەتە سێوەوە ناهێڵێت ئەم زیانە ڕووبدات کەواتە ئەگەر ئەم هەموو سوود و حیکمەتە لە تەنها سێوێکدا هەبێت ئەی دەبێن مەبەستی لەم گەردوونەدا چی بێت ئەمە بچووکترین نموونە بوو بۆ ئێوەی ئەزیزانم خستە ڕوو بۆیە ئەزیزانم ئەم گەردوونە زۆر فراوانە ئەوەی ئێمە لەسەر گەردوون دەیزانین زۆر کەمە لە بەرامبەر ئەو هەموو یاسا و حیکمەتەی خودا بە بچوکترین تاوەکو گەورەتریین شتی و ئەم گەردوونەی بەخشییوە، کەواتە شتانێکی زۆر هەن کە ئێمە پێیان نازانین بۆیە با

هەوڵبدەین زیاتر لەم گەردوونە بکۆڵینەوە بێگومان دەتوانین ئەو شتانەی کەونن بە دەرییان بخەین بەمشێوەیە هەم کۆمەڵگە و هەم جیهان بەرەو پێش دەبەین وە زیاتر هەست بە گەورەیی و دەسەڵات و بەخششی خودای گەورە دەکەین وە لەگەڵ بوونی زانست و زانیاری دەربارەی شتەکان دەتوانین چێژ لە ژیان وەربگرین وە ئاسوودە و دڵخۆش بیین بۆیە هەمیشە دەڵێم: (زانست) واتا (ژیان) ئێستا بیربکەوە و بڕیار بدە. ئامادەیت ئەو بوارەی زیرەکی خۆتی تێدا دەدۆزییتەوە، سەرکەوتن تێیدا بەدەست بێنێت؟

## [ قەزا و قەدەر]

یەکێك لە پایەکانی ئیمان باوەڕبوونە بە قەزا و قەدەر، هەروەك چۆن باوەڕمان بە خودا و پێغەمبەران و فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و ڕۆژی دوایی هەیە ئاواش پێویستە باوەڕمان بە قەزا و قەدەر هەبێت. ئێمەی مرۆڤ کە هیوا و ئامانجێکمان هەیە لە ژیان ئەگەر بۆمان هاتەدی دڵخۆشیین بەڵام بەداخەوەم زۆربەی مرۆڤەکان ئەو شتەی ئاواتی بۆ دەخوازن ئەگەر نەهاتەدی وا دەزانن کارەساتە هەست دەکەن بوونیان لەم ژیانە هیچ نرخێکی نییە پەنا دەبەن بۆ خۆکوشتن بەڕای تۆ خۆکوشتن چارەسەرە؟ یانی ئەگەر لەم ژیانەدا ئەوەی ویستت بۆت نەبوو دەبێت واز لە ژیانکردن بێنییت! نا ئەزیزم ئەگەر بەم جۆرە بیردەکەیتەوە زۆر هەڵەیت، خودای بەخشندە خۆشەویستانی خۆی زیاتر تاقیدەکاتەوە بە ناخۆشی وبەڵا و موسیبەت، لەبەرئەوە یەکێکی تر لە ڕێگاکانی بەختەوەری باوەڕبوونە بە قەزا و قەدەر وە هەریەك لە ئێمەی مۆڤ چارەنووسمان دیاری کراوە تەنها (نزا و پاڕانەوە، سەدەقە) دووهۆکارن کە بەهۆیانەوە چارەنووسی مرۆڤ ئەوەی کە بۆی دیاریکراوە دەگۆڕێت وە دڵنیابە کە قەزا و قەدەر (فەرمانی خودایە بەوەی کە دەیزانییت) خودای گەورە دەزانێت بۆ ئێمەی مرۆڤ چی باشترینە. لەبەرئەوەی داهاتووی

ئێمە دەزانێت وە دەزانێت لەچ کاتێك چ بڕیارێك دەدەین، ئەزیزم  ئەوە لەبیرمەکە خودا تۆی زۆر خۆشدەوێت بۆیە ناخۆشتریین ڕووداوەکان بۆتۆ دەکاتە تاقیکردنەوە، کەواتە دەبێت barووdoxە سەختەکان هۆکار بن بۆ پتەوبوونی باوەڕەکەت وە ئارامگرییت بۆئەوەی خودای گەورە باشترین پاداشتت بکات. لەسورەتی الشرح ئایەتی ژمارە٦ خودای گەورە دەفەرموویت:[إِنَّ مَعَ آلعُسرِ يُسراً]. واتا :بێگومان لەگەڵ هەموو ناخۆشییەك خۆشییەك هەیە..

سەبارەت بەم ئایەتە دەمێك بوو مێشکم خەریکی گەڕان بوو بەدوای ئەو پرسیارەی ئەگەر لەگەڵ ناخۆشیی خۆشیی هەبێت ئەی بۆچی ئێمە هەستی پێناکەین؟ ئایا لەدوای ناخۆشی خۆشی دیت؟ با ڕوونی بکەینەوە بگەین بە ڕاستترین وەڵام، مرۆڤ لەم ژیانەدا تەنها ئەوە دەبینێت کە لەبەرچاوی ڕوودەدات لەبەرئەوە کە تووشی ناخۆشییەك دێت تەنها هەست بە لایەنی نەرێنی ڕووداو و کارەساتەکە دەکات، بەڵام خودای گەورە زانایە بە هەموو ئەوەی کە دەیزانێت وە دەزانێت چی بۆ ئێمە پێویستە بێتە ڕێ .. گومانت لەوەشدا نەبێت خودای گەورە باشترینەکان بۆ بەندەکانی بریار دەدات باسی هەندێك نموونە دەکەین (نەخۆش دەکەویین و تووشی ئازار دەبییت) دەڵێن خۆشی ئەوە

لەکوێیە؟ ئەوکاتەی شوێنێکی جەستەت ئازاری دەبێت فێردەبییت نرخی بزانییت وە ئارامدەگرییت لەسەر ئەم ئازارە خوداش بە ئارامگرییەکەت بەخێر و چاکە بۆتی دەنووسێت کە ئازارەکەت نامێنێت دڵخۆش دەبییت بەوەی چاك بوویتەوە، بیربکەوە ئازار بەخششی خودایە ڕەنگە بپرسییت ئەوە چۆن؟ لەتۆ دەپرسم ئەگەر ئازارت نەبێت دەچییت بۆ لای پزیشك؟ بێگومان نەخێر خودای گەورە ئازارت پێدەدات تاوەکو بە ئاگا بێیت لەوەی ئەو شوێنەی بە ئازارە کێشەی هەیە کە هەستت کرد ئازارت هەیە دەچییت بۆ لای پزیشك و چارەسەر وەردەگرییت کەواتە ئەوە گەورەترین نیعمەتی خودایە کە پێتی دەبەخشێت. کاتێك ئەزیزترین کەست گیان دەسپێرێت هەمووومان دەزانین چەندە سەختە. بەڵام ئەوەش بزانە خودا بە باشی زانیوە گیانی ئەو کەسە بباتەوە ڕەنگە خودا نەیەوێت لە زەویدا تووشی تاوان بێت یان ڕەنگە کەسێکی خراپ بێت تاوەکو زیاتر خراپە نەنێتەوە خودا بیباتەوە لای خۆی بەهەر جۆرێك بێت ڕەنگە مردنەکە بۆ ئەو کەسە باشترین بێت (هەژارییت خاوەن خێزان و منداڵییت، بێگومان دەردی هەژارییش سەختە) بەڵام لەسەر ئێمە پێویستە هەوڵبدەین وە خۆڕاگربیین سوپاسی خودا بکەین، ڕەنگە ئەم هەژارییە تاقیکردنەوە بێت بۆ تۆ، بۆیە ئارامگربە.

دڵنیابە هەر ڕووداوێك هەر کارەساتێك هەر ناخۆشییەك کە ڕوودەدات خێری پێوەیە. وە هەموو خێرێك هۆکارێکی هەیە. لەئێستادا خەڵك زۆر تووشی ناخۆشیی و کارەسات و ڕووداو دەبێت. بەشێوەیەکی گشتی جیهان بەرەو خراپ بوون و کوفر و بێ باوەڕی دەچێت.... هۆکارەکەشی ئەوەیە ئارام ناگریین زوو بڕیار دەدەین هەرچییەکی بە چاوەکانمان دەبینین یەکسەر باوەڕی پێدەکەین ڕەنگە ئەوەی دەبینییت تەنها نمایش بێت بۆ هەڵخەڵەتاندنی تۆ. خودای گەورە و بەخشندە هەمیشە موژدە بە بەندەکانی دەدات لە سورەتی (الطلاقق) ئایەتی ژمارە (٧) دە فە رمووێت [سَيَجعَلُ اللهُ بَعدَ عُسرٍ يُسرًا] واتا :دڵنیابن کە پەروەردگار دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت.. و دوای ناخۆشیی خۆشیی دەهێنێت.. ئەم خۆشییە مەبەستی لە کردنەوەی دەرگای ڕەحمەتی خودایە لەدوای بەڵا و موسیبەت و نارەحەتییەکان کە ڕووناکی دەخاتەوە ژیانییان خۆشییەکە ڕەنگە هەست پێکراو و ماددی بێت وەك ئەو کەسەی زۆر هەژارە و دواتر دەرگای خێری لێدەکرێتەوە، یان خۆشییەکی مەعنەوییە کەسێك تووشی تاقیکردنەوەیەك دێت خودای گەورە هێزێکی مەعنەویی و ئارامگرییەکی وای پێدەدات کە لە توانای مرۆڤی ئاسایی بەدەرە .. ناتوانیین زۆر ورد بیینەوە لە بابەتی قەزا و قەدەر تەنها ئەوە بزانین هەموو شتێك کە خودا دەیهێنێتە ڕێمان باشترینە بۆ ئێمەی

مرۆڤ مەڵێ بۆچی ئەم هەموو ناخۆشییە ڕووی تێکردووم چونکە خودای گەورە لە سورەتی (الرمز) ئایەتی ژمارە (١٠) دەفەرموویت: [إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّبِرُونَ أَجرَهُم بِغَيرِحِسَاب] واتا بەڕاستی تەنها خۆڕاگران پاداشتییان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە. یەکێکی دیکە لە بەڵگەکان خودای گەورە دەفەرموویت: [أَشَدُّ النَّاسِ بَلاءً اللأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الصَّالحُونَ ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ] (٣٨٥٥ ل ٦٢٦). واتا توندترین کەس بەڵا و موسیبەتی تووش بێت پێغەمبەرانن پاشان پیاو چاکان لە پاشان ئەوانی پلە نزمترە. ئەزیزم لەوانەیە ئارامگرتن بەلاتەوە زۆر قورس و سەخت بێت بەڵام پێویستە بۆ بەختەوەری ژیانت وە ئاسوودەبوونی دڵ و دەروونت بەسەر دەروونت زاڵ بیت لەسەر ئارامگری خۆت ڕابێنییت ئەگەر لەمن دەپرسییت ئەم ئارامگرییە چۆن بەدەست دێت؟ زۆر ڕێگا هەن بەهۆیەوە ئارامییت دەست دەکەوێت (نوێژکردن، زیکرکردن، بیرکردنەوە لە دەسەڵات و بەدیهێندراوەکانی پەروەردگار، بیرکردنەوە لە دواڕۆژ، چاکەکردن، بەخشیین، دڵخۆشکردنی خەڵك هتد..) ئەوانە هۆکاری ئارامی دڵ و دەروونی مرۆڤن بە ئەنجامدانیان دەبیتە مرۆڤێکی ئاسوودە و دڵخۆش لەهەمان کاتدا بە فەرمانی خودا هێزێك درووست دەبێت تاوەکوو بەسەر دەروونی خۆتدا زاڵ بییت وە ئارام بگرییت خوداش خێر و چاکە و پاداشتت دەکات. ڕووحەکان لە تاوانەکان پاك

دەبنەوە. کەواتە با هێزی ئارامگرتن بەدەست بێنیین. ئەوکات باوەڕ بەدەست دێنیین. لەوکاتەشدا ئاسوودە و دڵخۆش دەبییت وە سوپاسگوزار دەبییت و ڕازی دەبییت بە قەزا و قەدەری خوودا.

## (چیرۆکی کوڕە گەنجەکە)

ئەو گەنجە دەگێڕێتەوە دەڵێت: هەر لەو کاتەی گەورەبووم و چوومە تەمەنی گەنجی هەرکاتێك کۆرپەیەکم دەبینی دەمکردە باوەشم بەجۆرێك زۆر ئاواتم بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوسەرگیریی بکەم و کۆرپەی خۆم لە باوەش بگرم. لەسەر بەردەوام بوونم لەم هیوا و ئارەزووە کچێکم ناسی، کچێکی بەڕێز و ڕەوشت بەرز بۆیە بەڵێنم پێیدا دوای ئەوەی کارێکم دەست کەوت و کەمێك پارەم هاتە دەست بچم بۆ داوای، لەو کاتەدا ئەو کارەی کە من دەمکرد بڕە پارەکەی بەم شێوەیە نەبوو کەمن پێویستم بوو بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەڵێنەم، بۆیە زۆر هەوڵمدا کارێکی دیکە بدۆزمەوە تاوەکو بڕێك پارەم دەستکەوێت و ئەو بەڵێنە ببەمە سەر کە داومە، بۆیە ڕۆژێك هاوڕێیەکم پەیوەندیی پێوەکردم گوتی کارێکی کۆمپانیا هەیە وە بڕە پارەکەشی (١٥٠٠) دۆلارە گوتی تۆ شارەزاییت لەو بوارەدا هەیە دڵنیام لە چاوپێکەوتنەکەدا تۆیان زۆر بەدڵ دەبێت، منیش لەوکاتەدا لە خۆشیاندا نەمدەزانی چی بکەم.

هەر ئەو کات بڕیارمدا بەپەلە بچم بۆ چاوپێکەوتنەکە، زۆر بە خێرایی بە ڕێگادا دەڕۆیشتم لەخۆشیاندا باڵم گرتبوو ئاگام لەخۆم نەمابوو کە ئایا

ڕێگاکە ڕاستە یان هەڵە، تەنانەت لە بری ئەوەی لەسەر شۆستە بڕۆم بە نێو شەقامدا ڕێم دەکرد، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لەڕێگادا تووشی ڕووداوێکی هاتووچۆ بم ئۆتۆمبێلێك لێمی دا و لە هۆش خۆم چووم.

کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم لە نەخۆشخانە بووم بەڵام چیم بینی و چی ڕووی دابوو! قاچی ڕاستەمیان بڕیبۆوە بەهۆی ئەم ڕووداوە چونکە زۆر بە سەختی پێکرابووم. لەوکاتەدا شۆفێری ئۆتۆمێلەکە کە لە منی دابوو هاتە ژوورەوە، کچێکی گەنج بوو وە ئەو هیچ تاوانی نەبوو لەم ڕووداوە ئەوە خەتای من بوو بەهۆی خۆشی دۆزینەوەی کار بیر و هۆشم لای خۆم نەمابوو، بەڵام ئەو زۆر بەڕێز بوو لە نەخۆشخانە زۆر خزمەتی منی کرد لە هەموو ڕوویێکەوە.

بۆیە لەو کاتەدا ئەو کچەی من خۆشم دەویست، ئەو کچەی بۆ ئەوەی بەڵێنەکەمی بۆ ببەمە سەر، ئەوەی بۆ دۆزینەوەی کار قاچم بۆی لەسەر دانا، کە زانی من قاچێکم لەدەست داوە و ناتوانم کاربکەم. هەر ئەو کاتەی من لە نەخۆشخانە بووم لای خۆی بڕیاری دا کە من ڕەش بکاتەوە لە خەیاڵ و مێشکی، چیتر دڵی بۆم واڵا نەکاتەوە. ئەویش خزمێکیان هات بۆ خوازبێنی و هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا کرد وەك بڵێی پیلانی

پێشوەختەی بۆ داندرابوو، بە بۆچوونی خۆی ژیانێکی شاهانە و خۆشگوزەرانی هەڵبژارد.

بە بیستنی ئەم هەواڵە بەجۆرێك دڵم تەنگ بوو دەمگوت خودایە گیان ئاخر ئەو هەموو شتە بۆچی بەسەر مندا هات ئارەزووم بە کۆرپەیەك بوو ئەویش نەبوو وە ئەو کارەی هەشم بوو لەدەستمدا ئەو کچەی خۆشم دەویست لەدەستم دا، لەو کاتە زۆر بەزەییم بەخۆمدا دەهاتەوە زۆر تەنیا و دڵتەنگ و چاو پڕ لە فرمێسك بووم، بۆیە لە نەخۆشخانە دەرچووم و چوومەوە بۆ ماڵەوە و ماوەیەك بەمشێوەیە بووم لە ماڵەوە چاوەڕێم دەکرد هەتاوەکو قاچێکی دەستکردم بۆ دابنێن.

هەر لەو کاتەدا جەنگ لە وڵاتتدا دروست بوو یەکێك لە هاوڕێ زۆر ئەزیزەکانم کە هەمان تەمەنی خۆم بوو بەناچاری دەبا بچێت بۆ سەربازی، یاساکە پەڵکێشی کرد بۆ بەرەکانی جەنگ و داهاتوویەکی نادیار چاوەڕوانی بوو. دوای چەند ڕۆژێك لە چوونی بۆ جەنگ لەبەر ئەوەی شارەزایی لە شەر و جەنگدا نەبووهەواڵم پێگە یشت کە کوژراوە، بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر خەمم خوارد بەڵام وتم خودایە سوپاست دەکەم ئەگەر ئەم قاچەم لەدەست نەدابا ئێستا منیش لەگەڵ ئەو دەبوو بچم بۆ جەنگ وە منیش لەگەڵ ئەو دەکوژرام.

زەمەن هاتوو ڕۆیشت، دوای چەند ساڵێك هەواڵێکم بۆ هات ئەو کچەی کە من خۆشم دەویست وە شووی بە کەسێکی تر کرد جیا بۆتەوە لە هاوسەرەکەی! لەبەر ئەوەی دکتۆر پێی گوتبوو کە هەرگیز ناتوانێت بێت بە خاوەنی منداڵ، تەواو بێ ئومێدی کردبوو. دووبارە گوتم خودایە سوپاس بۆتۆ ئەگەر هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەو کردبا ئەو هیوایەم نەدەهاتە دی کە کۆرپەی خۆم لە باوەش بگرم، ببێتە ئارامی دڵ و دەرونم.

بەهەمان شێوە ئەو کۆمپانیایەی من دەمویست کاریان لەگەڵدا بکەم و بەهۆیەوە توشی ئەو ڕوداوە بوو کە قاچم لەسەر دانا، گوتیان ئیفلاسیان هێناوە پارەی هەموو کارمەندەکانیان بردوو بۆیان نەگەڕاندنەوە، دووبارە سوپاسی خودام کرد لەوەی کە لەو کۆمپانیایە کارم نەکرد. مرۆڤ نازانێت خێر لە چی دایە و چی باشی بۆ دانراوە، ڕەنگە هەندێك ڕوداو بەسەرماندا دێت ناخۆش بێت بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە خودای گەورە بە باشتر و چاکتر قەرەبومان دەکاتەوە.

دواتر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو کچەی بە ئۆتۆمبێلەکەی لێمیدا، دیار بوو بە دوای ماڵی ئیمەدا گەڕابوو، بۆیە هاتە ماڵمان کە زانی ئێمە ماڵێکی هەژارین گوتی من زۆر بەداخەوەم بەوەی کە ڕووی دا، منیش گوتم

نەخێر تۆ تاوانت نەبوو من بە پەلە بووم و خۆم خستە بەردەم ئۆتۆمبێڵەکەی تۆ. لەوکاتەدا کچەکە گوتی من داوایەکم لەتۆ هەیە ئەگەر تۆ ڕازیی بیت، گوتی من دەمەوێت هاوسەرگیریی لەگەڵ کوڕێکی وەك تۆ بە ڕەوشت بکەم! وە دایکم وباوکیشم رازینە گەر ئەو کوڕەی دەبێتە هاوسەرم کەسێکی دەستپاك و ڕەوشت بەرز و دیندار بێت. تۆ ئەو کەسەی کەمن بەدوایدا دەگەڕێم تاوەکو هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم ئیدی خودای گەورە تۆی بە قەدەر بۆمن هێناوە و من هۆکاری لەدەستدانی قاچت بووم بەڵام نەمانی قاچت بەشتێکی عەیب ناچێت بۆیە ئەگەر تۆ ڕازی بیت هاوسەرگیریی دەکەین. منیش لەوکاتەدا توشی سەرسامی ببوم بەوەی کە هیچ کات بیرم لەوە نەدەکردەوە کە کچێك ئاوا دەوڵەمەند ئەو داوایە لەمن بکات، بۆیە منیش ڕازی بووم وە هاوسەرگیرییمان کرد.

دواتر من بووم بە بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەی باوکی، دوای چەند ساڵێك بووم بە خاوەنی چەند منداڵێك، دووبارە ئەوەندە گریام گوتم خودایە تۆ باشترینت بۆمن هێنا من تەنها کرێکارێك  بووم ئێستا بەڕێوەبەری کۆمپانیام وە خاوەنی باشترین و بەڕێزترین ئافرەتی دوونیام وە کۆرپەی خۆمم لە باوەش گرت کە هیوا و ئارەزووم بوو سوپاس بۆتۆ خودایە.

**بەڵێ ئەزیزانم کەواتە ئێمە نازانین خێری قەزا و قەدەر لەچی دایە با سوپاسی پەروەردگارمان بکەین لەوەی کە بۆمانی دەهێنێت چ لەخۆشی یان لە ناخۆشی چونکە دڵنیابن خودا باشترین بۆ بەندەی خۆی بڕیاردەدات.**

**(کەوتنەکان هۆکارن بۆ سەرکەوتن)**

**ئێمەی مرۆڤ وا ڕاهاتووین لە کارەکانمان لە ئامانجەکانمان لە ویستن و لە ئارەزووەکانماندا وە لە زۆربەی پێویستیە دونیاییەکانماندا هەر کە تووشی کەوتن بین ڕاستەوخۆ بڕیار دەدەین تەواو ئیتر ئەمە شکستی منە ناتوانم بەردەوام بم سەرکەوتن بەدەست ناهێنم! ئەزیزەکەم ئەم بڕیارە گەورەترین خیانەتە لەگەڵ ژیانی خۆتدا دەیکەیت لەسەرەتادا کە تووشی کەوتنێك دەبیت زۆر ئاساییە. ئێمە لەوکاتەی لەدایك دەبین هیچ نازانین وە کەس هیچ شتێك نازانێت ئایا هیچ مرۆڤێك لە سکی دایکی فێری شت دەبێت؟؟**

**بێگومان نەخێر لەبەرئەوە زۆر ئاساییە هەڵە بکەین یان تووشی زیانێك بین یان تووشی کەوتنێك بین، بۆیە پێویست ناکات بەتەنها هەڵەیەك یان کەوتنێك ببێتە خێرا بڕیاردانمان لە ژیان لەبەرئەوەی گومانی خراپ هێز و توانا و بوێری لە مرۆڤ لاواز دەکات. ئێستا کاتی ئەو پرسیارە گرنگەیە کەلە تۆی ژێر بپرسین ئایا دروستە بە هەموو هەڵە و کەوتنێك بڵێین شکست؟ تۆ دەزانیت شکست واتای چی؟ با نهێنیەکت پێ بڵێم هەر تاکێکی کۆمەڵگا خۆی بەرپرسی ئەو شکستەیە کە تووشی دەبێت، دڵنیام تووشی سەرسوڕمان بوویتە لەئێستادا کۆمەڵێك ڕەخنە لەم بیر و**

ڕایە دەگریت چۆن دەبێت ئێمە خۆمان هۆکاری ئەو شکستە بین کە هەرگییز نامانەوێت؟ نا نەخێر من هەرگیز نەمویستووە شکست بێنم بەڵام هەمیشە کۆمەڵێك بەربەست هەن لەپێش سەرکەوتنەکان وەك بەربەستی ماددی، ڕێگری مرۆڤەکان، هەڵە و کەوتنەکان، نەزانین، دوو دڵی و ڕاڕایی، یاساکانی دەوڵەت، بڕیارە لەناکاوەکانی حکوومەت، ڕەخنەکانی بەرامبەر، بەکەم وەرگرتنی حەز و ئارەزووەکانمان لەلای خەڵکی هتد..

ئێستا چی لەبارەی ئەم هەموو هۆکارانە کە هەمیشە تووشی مرۆڤەکان دەبن وە لەسەر ڕێگاکان دەبنە بەربەست تاوەکو شکست بە مرۆڤ بێنن؟ بەڵێ ئەزیزم، ئەوانەی تۆ باست کردن لە ژیانی تۆش و منیش وە هەر مرۆڤێکی دیکەدا ڕوودەدات، بەڵام مرۆڤی وا هەیە بەربەستی کەمترە لە ئاستی مرۆڤێکی تر ئەمەش پەیوەستە بەو ژینگە و خێزان و پەیوەندییەکان و هەموو بارودۆخەکانی ژیانی ئەو مرۆڤە بۆیە نابێت لەهەموو کاتێکدا خۆمان بە کەسانی دیکە پێوانە بکەین. سەرەڕای هەموو بەربەستەکان ئەوە خۆتیت کە بڕیار دەدەیت شکست بێنیت مرۆڤ هەمیشە هەستێکی عاتیفی (میهرەبان وسۆز و بەزەیی) لە ناخییدا بوونی هەیە بەڵام دەبێت بزانیت کەی کار بەم هەستە دەکەیت

وە کەی کاری پێ ناکەیت لەبەرئەوەی هەندێ جار بەم هەستە مرۆڤ فریو دەخوات بۆیە هەوڵبدە سنوور بۆ هەستەکانت دابنێیت بەپێی بارودۆخەکە، فیترەتی هەموو مرۆڤێك وایە دەیەوێت هەمیشە و لەهەموو ئەو شتانەی خۆی داوای دەکات سەرکەوتوو بێت وە پێی بگات وە هەمووشمان ئەوە دەزانین هیچ سەرکەوتنێك بەبێ هەوڵ و ماندووبوون و ڕەنج و مەینەتی بەدەست نایەت کەواتە چی تۆ ناچار دەکات زوو بڕیار بدەیت؟ ئەو مرۆڤانەی زوو بڕیار دەدەن ئەم قسانە دەکەن: من بەردەوام نابم شکستم هێنا من فێریی ئەم شتە نابم من شایانی ئەو سەرکەوتنە نییم من بێ شەنسم.. هتد....

تۆ دەزانیت؟ هەموو ئەو شێوازیی قسە و ڕاو بۆچوونانە مرۆڤی ڕاڕا و بێ هێز دەریدەبڕێت بەتایبەت ئەوانەی باوەڕیان لاوازە، لەپێش هەموو شتێك ئێمە باسی باوەڕمان کرد لەبەرئەوەی مرۆڤی خاوەن باوەڕ دەزانێت سەرکەوتن بەبێ کەوتن نایەتە بوون وە هەمیشە ئارامگرە لەکاتی کەوتنەکان وە دڵنیایە لەوەی شتێك قسمەتی نەبێت دوای هەوڵدانی زۆر کەواتە خێری گەورەی بۆ ئەو هەیە، وە خودای گەورە دەرگایەکت بەسەردا دابخات بە هەزاران دەرگات بۆ والا دەکات تاوەکوو

سەرکەوتنت تێدا بەدەست بێنیت، من هەمیشە وتوومە مرۆڤی سەرکەوتوو ئەو مرۆڤەیە کە کەوتنەکانی بکاتە هۆکاری سەرکەوتنەکانی.

ئێستا با بزانیین شکست چییە؟ شکست بریتیە لە ویستی مرۆڤ بۆ سەرنەکەوتن مرۆڤ تووشی شکست دەبێت کاتێك گومانی خراپ لەدوای هەر کەوتنێك زاڵبێت بەسەر ئارامگریی و لەدەستدانی دەرفەتەکان دواخستنی کارەکان وە نەبوونی باوەڕ کە گومانی باش بە مرۆڤ دەدات وە لاسایی کردنەوە بۆ دەستکەوتە دونیاییەکان هتد.. کەواتە با ئەم خاڵە لاواز و نەرێنیانە بپووکێنینەوە هەموو کەوتنێکی سەرەتا هۆکارەکەی نەزانییە ئەوەمان قبوڵە لەبەرئەوە ئاساییە کۆمەڵێك ڕێگای نوێ تاقیبکەینەوە دەی خۆتۆ شارەزای ڕێگا نوێیەکە نیت دەکرێت زەرەرت پێ بگات هەڵە بکەیت لە سەرەتادا وە بکەویت بەڵام چانسی دیکەت هەیە دەتوانیت هەڵەکە ڕاست بکەیتەوە  وە دووبارەهەڵسیتەوە راستە ئەم هەڵسانەوەیە دوای ئەو هەموو زەرەر و زیانە بەم جۆرەش ئاسان نییە  بەڵام ئەوەشت بیر نەچێت تۆبۆ ئامانجێك هەوڵدەدەیت هێزێکی ئەرێنی هەیە پاڵت پێوە دەنێت بەرەو سەرکەوتن کە هەوڵدەدەیت ماندوو دەبیت بەڵام کە دەرئەنجامەکەی دەبینیت هەموو شتێك بەدڵی تۆ دەبێت هەموو ماندووبوون و ئازار و

ناڕەحەتییەکانت دەکەیت بە چیرۆکێك وەك نموونەیەك بۆ هەموو بارودۆخەکانی ژیانت تاوەکو هێز و توانا و گومانی باشت پێ ببەخشێت.

لە سورەتی (آل عمران) ئایە تی ژمارە (١٣٩) خودای گەورە دەفەرموویێت:(وَلَا تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ). واتا: لاواز مەبن و ساردمەبنەوە وە خەم و بەژارە داتان نەگرێت، چونکە هەر ئێوە سەربەرز و سەرفراز و سەرکەوتوو دەبن، ئەگەر بە تەواوی مانا باوەڕدار بن .لەبەرئەوە هەر کە تووشی کەوتن و هەڵە و زەرەر و زیانێك بووین با بە ئەرێنیی بیربکەینەوە هیوامان زیاتر بێت کە سەرکەوتن زۆر لێمانەوە نزیکە بۆیە ئەزیزەکەم هەرگیز کۆڵمەدە بیربکەوە لە هەموو هەنگاوێك خودا لەگەڵتە هێزی پەروەرێن بۆ هەموو کارێك بەسە پێشینان ڕاستییان گوتووە، (هەتا هەڵە نەکەیت فێر نابیت) بۆیە هەتا نەکەویت چێژ لە سەرکەوتن وەرناگریت، لەژیاندا شتێك بوونی نییە بەناوی شکست ئەوە خۆتیت شکست دێنییتە بوون خۆتیت وا بیردەکەیتەوە کەشکستت هێناوە ئەمانە شکست نین بەڵکو تاقیکردنەوەن، ئەزموونن، بەهێزبوونن، سەرکەوتنن، ئەوە بزانە کەوتنەکانت سەرکەوتنیی تۆیە، لەبەرئەوە ژیان تا ئەو ڕۆژەی کە

دەمریت تاقیکردنەوە و ئەزموونە با هەندێ نموونەی جوان و سادە بهێنینەوە، منداڵێك کە سەرەتای چونیەتی بۆ قوتابخانە نازانێت بخوێنێتەوە، بنووسێت، دەی خۆ لە یەکەم ڕۆژەوە بە ئاسانی فێری نابێت وە بێگوومان بێ هەڵەش نابێت سەرەتا لە نووسین و خوێندنەوەی پیتەکانەوە دەست پێدەکات مامۆستاکەی یارمەتی دەدات ئایا ئەگەر چەند جارێك هەڵەی کرد لە نووسین و خوێندنەوەی پیتەکان مامۆستاکەی لە قوتابخانە دەری دەکات ؟ یاخوود دەڵێت: تۆ سەرکەوتوو نابیت فێری خوێندنەوە و نوسین نابیت؟ بێگوومان نەخێر بەڵکو پێویستە لەسەر مامۆستاکە زیاتر هەوڵی لەگەڵ بدات بزانێت کێشەی ئەم قوتابییە چیە؟ وە قوتابییەکەش زیاتر هەوڵدەدات وماندوو دەبێت بەڵام دەزانێت لە کۆتاییدا هەر فێری دەبێت کەواتە ئامانجی فێربوون ئەم قوتابیە هاندەدات کە هەوڵبدات تاوەکو فێربێت.

ئافرەتێك سەرەتای ژیانی هاوسەرگیریەتی بەڵام نازانی خواردن ئامادە بکات وە پێشتر تاقینەکردۆتەوە ئەو نیگەرانە لەبەرئەوەی نایزانێت بەڵام بیردەکاتەوە پێویستە فێری ببێت تاوەکو زیاتر خۆشەویست بێت لای هاوسەرەکەی ئەم ئامانجە دەبێتە پاڵنەرێك وە هەوڵی بۆ دەدات سەرەتاکان هەڵە دەکات رەنگە خواردنەکە خۆش دەرنەچێت یان

دەسووتێت یان شتێکی کەمە بەڵام کۆڵنادات و بەردەوامە دوای ماوەیەك دەبینێت زۆرباش فێری بووە بەمەش خۆشەویستی هاوسەرەکەی زیاتر بەدەست دێنێت، منداڵێك تازە دەیەوێت پێیەکانی بگرێت بەڵام زوو زوو دەکەوێت ئازاری پێدەگات ماندوو دەبێت بەڵام کۆڵنادات و بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی بە قاچەکانی دەڕوات، پیاوێکی خاوەن خێزان و منداڵیت پێویستە کاربکەیت و پارە بۆ خێزان و منداڵەکانت بەریتەوە کارێك دەدۆزیتەوە کە پێشووتر تاقیت نەکردۆتەوە بەڵام هەستی باوکایەتی وات لێدەکات لەپێناو سۆز و خۆشەویستی خێزان و منداڵەکەت هەوڵدەدەیت، سەرەتاکان هەڵەی زۆر دەکەیت بەڵام ئامانجەکەت هانت دەدات تا فێری دەبیت.

کاتێك ڕێگایەك تاقیدەکەیتەوە نازانیت ئەمە ڕێگا ڕاستەکەیە یان هەڵەکەیە ئەگەر بۆ چەند جارێك هەوڵتدا و کەوتیت ئەوکات بزانە ئەمە ڕێگا هەڵەکەیە وە ئەم هەڵەیە بۆ تۆ ئەزموونێکە جارێکی تر ئەم هەڵەیە دووبارە ناکەیتەوە ئەمەش زیاتر لە ڕێگای ڕاست و سەرکەوتن نزیکت دەکاتەوە.

پێشترییش وتوومە لە ژیانمدا شتێکم بنیات نەناوە بەمانای شکست لە سەرکەوتنەکان زیاتر فێربووم وە سوپاسگوزاری پەروەرێن بووم لە

کەوتنەکان و هەڵەکانیشدا زیاتر ئەزموونم وەرگرت ئەم ئەزموونانەش منیان گەیاندە سەرکەوتنی زیاتر. "ئەلبێرت ئەنیشتاین" لە وتەیەکدا دەڵێت: "ئەو کەسەی هیچ هەڵەیەکی لە ژیاندا نەکردووە هەرگیز هیچ شتێکی نوێی تاقینەکردۆتەوە". کەواتە سەرکەوتن پێویستی بە باوەڕە، کۆڵنەدان، هێز، بوێری، ڕەنج و مەینەتی، گومانی باشی، گەشبینی هتد.

کورتە چیرۆکێك سەبارەت بە گەیشتنم بەم کۆلێژەی کە ئارەزووی خۆم بوو. لە قۆناغی پۆلی ١٢ئامادەیی بووم، کە لەم قۆناغەدا زۆربەی قوتابیان تووشی ترس و دڵەڕاوکێ و بێزاری و نیگەرانی و شکست دەبن منیش کۆمەڵێك بەربەست هاتنە بەردەمم بۆیە لەم ساڵەدا نەمتوانی ئەو نمرەیە بێنم کە هۆکاری گەیشتن بە کۆلێژەکەم بوو بۆیە تووشی کەوتنێك بووم کە چاوەڕێم نەدەکرد بەڵام هەرگیز بێ ئومێد نەبووم باوەڕم بە خوودا هەبوو کە یارمەتیدەرە و متمانەم بەخۆم بوو لەدوای ئەم کەوتنە بیرم کردەوە و پلانم دانا بۆ ساڵی دووەم، شێوازی خوێندنم گۆڕی بەم جۆرە گومانی باشم دەبرد بۆ ئایندەیەکی گەش، گوێم بە قسە ڕووخێنەرەکان نەدەدا لە هەوڵدان بەردەوام بووم سوپاس و ستاییش بۆ

ئەو خودایەی کە هیچ شتێك لای ئەو مەحاڵ نییە بەم جۆرەی کە خۆم پلانم بۆی دانابوو پێی گەیشتم.

کاتێك ئەم کتێبە دەنووسم لەوانەیە چەندەها ڕەخنە لەم کتێبە بگیرێت بەڵام چونکە خۆم ویستم لەسەر وە هەوڵی بۆ دەدەم پشت بە خودا ڕەخنەکان زیاتر من بەهێز دەکەن تاوەکو زیاتر وە باشتر هەوڵ بدەم. یەك یاسای سەرکەوتن هەیە لە ژیاندا ئەوییش (سەرکەوتن*ویست و ئارەزوو*هەوڵدان+لێهاتوویی) ئێمە بۆئەوەی سەرکەوتووبین سەرەتا دەبێت ویست و ئارەزومان هەبێت لەو شتەی کە هەوڵی بۆ دەدەین وە بێگومان هەر شتێك هەوڵی بۆ نەدەیت ناتوانیت پێی بگەیت دواجار دەبێت لێهاتووبیت یان کۆشش بکەیت تاوەکو لێهاتوویی زیاتر بەدەست بهێنیت لەو شتەی کە ئامانجی ژیانتە و هەوڵی بۆ دەدەیت..

هەروەك پێغەمبەرمان محمد (د.خ) دەفەرمووێت: (فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ) واتا: کەی تەواو بوویت دووبارە دەست پێبکەرەوە، کەواتە لەکوێ کەوتیت دووبارە هەڵسەوە، ڕێگای چوونت بەرەو سەرکەوتن بگۆڕە بەڵام هەرگیز ئامانجەکەت مەگۆڕە وە من لەژیانی خۆمدا شکست بە دووجار سەرکەوتن دەزانم، چونکە زۆر ڕێگا تاقیدەکەیتەوە کە تێیدا

سەرکە وتوو نابیت واز لەو ڕێگایە دەهێنیت بەرەو ڕێگایەکی تر دەڕۆیت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت کەواتە شکست ڕێگای سەرکەوتنت نیشان دەدات.

هاوڕێی نزیکم (بێلان) کە قوتابییەکی زیرەك و نموونەیی بوو ڕۆژێك لێم پرسی چۆن بتوانم بەو شتە بگەم کە ئامانجمە بە زەردەخەنەوە گوتی: (هەموو شتێك بە ئاسانی وەربگرە بەڵام هەوڵێکی باشی بۆ بدە) ئەم قسەیەی ئەو زۆر کاریگەری ئەرێنی لەسەر ژیانمدا هەبووە، هیوادارم خودا نموونەی ئەم جۆرە مرۆڤانە زۆر بکات منیش دەڵێم: ئەگەر ئێمە هەوڵبدەین شتەکان بە ئاسانی وەربگرین لەرووی دەروونییەوە بەهێز دەبین وە هێزێك لە ناخماندا درووست دەبێت و دەبێتە پاڵنەرێك بۆ سەرکەوتن و ئارەزووومان زیاتر دەبێت ئینجا هەوڵی باشی بۆ دەدەین لە ئەنجامدا ئەگەر ویستی خودای لەسەر بێت بێگوومان سەرکەوتوو دەبین.

ئێستا بیربکەوە و بڕیاربدە، ئامادەیت بڕۆین بۆ تەوەری دواتر؟

(خەم مەخۆ لە ڕابردووت ترست نەبێت لە داهاتووت)

بوونی مرۆڤ هەمیشە لەسەر ڕێڕەوی بازنەیی بە سێ قۆناغ دەخولێتەوە قۆناغی ڕابردوو ئەوەی کە تێتپەڕاندووە وە ئەوەی کە ئێستا لە ناویدا دەژیت وە ئەو قۆناغەی کە هێشتا پێی نەگەیشتووە واتا (داهاتوو) رابردووەکانمان جێهێشتووە. لەئێستادا تێدەکۆشین تاوەکو بگەین بە داهاتوویەکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی زۆرینەی مرۆڤەکان خەم دەخۆن لەوەی لە رابردوو ڕووی داوە. ئا لێرەدا ئێمە زیانێکی گەورە بە دەروون و ژیانی خۆمان دەگەیەنین. لێرەدا پرسیارێك دەکەین بۆچی خەم لە رابردوو دەخۆیت؟

ئەزیزم هەندێ شت پێویستە بیریان لێبکەینەوە ئینجا بڕیاری لێبدەین، بیربکەوە خەم خواردنت بۆ رابردوو هیچ لە راستییەکان دەگۆڕێت؟ ڕەنگە هەندێ هەست بە ناخۆشی و خەمەکانت بکەم لەبەرئەوەی هەموومان مرۆڤین. وە چیرۆکی تاڵ لە رابردووماندا هەیە بەجۆرێك ئێستاش کاریگەریی زۆربەیان لە ژیانماندا ماوە، لەبیرکردنیان ئەستەمە کە دێتەوە یادت ناخۆشییەکان دەتخەنە گریان. ئەزیزم، من بۆتۆ دەنووسم تاوەکو پێت بڵێم: بائەم تەمەن و ژیانە پیرۆزەی کە هەمانە بە شتانی بێ سوود لەخۆمانی تاریك نەکەین.

وەرە بەیەکەوە کێشە و گرفت و ناخۆشیەکانی رابردوومان بخەینە ڕوو تاوەکو لێرەوە ئەم خەم خواردنە بنبڕ بکەین، چی بوون ئەو ناخۆشییانەی لە رابردوودا توشمان بوون؟ (باش بووین لەگەڵ زۆرێکیان، کەچی ئەوان سپڵەیان نواند؟ نرخی تۆیان نەزانی؟ تۆ باش بوویت ئەوان خراپ بوون؟ نەکەی پەشیمان بیتەوە لەوەی کە باش بوویت وە بەڕێز بوویت چاکەت لەگەڵیان کردووە، بەڵکو دڵخۆش بە لەبەر ئەوەی مرۆڤی باش سەربەرزە دواجار ئەوانەی لەگەڵت خراپ بوونە لە ناخەوە پەشیمانی دەردەبڕن. (دەرفەتێکت بۆ ڕەخسا کەچی لەدەستتدا بەهۆی قسەی دەورووبەر؟ یاخوود هەڵە بیرکردنەوەی خۆت؟ بۆ ئەمەش خەم مەخۆ سەرەتا ئەزموونی لێوەربگرە کە لە ئێستا و داهاتووت بەقسەی هیچ کەس دەرفەتەکان لەکیس خۆت مەدە وە ڕەنگە خێری تێدا بێت خودای گەورە باشترینی بۆت دانابێت.(لەرابردوو هەڵەیەکی گەورەت ئەنجامداوە و لێی پەشیمانی وەك تاوانی کوشتن، گزی، خیانەت، خراپ مامەڵەکردن، فرت و فێڵ، ئازاردانی کەسێك، یاخود قسەیەکی ناشرینت بەکەسێك وتبێت، هتد..) شیرینم ئەگەر لەدوای هەرتاوانێك کە ئەنجامت دابێت پەشیمان بوویتەوە تەوبە بکە دڵنیابە خودا بەندەی خۆی وەردەگرێتەوە. کە تەوبەت کرد وە ئەوکاتەی ئازار و

پەشیمانیت چەشت تۆ پاك دەبیتەوە. وە هەرگیز لە ژیانت هەڵە و تاوانەکان دووبارە مەکەوە ئەمەش خۆی ئەزموونێکە.

(ئازیزێکت لەدەستداوە؟ دەزانم سەختترین ئازار لەدەستدانی ئازیزێکە بەڵام دەبێت باوەڕت بەوە هەبێت لە دونیاکەی دیکەدا بەیەکتر شاد دەبنەوە، بۆیە وا مەزانە جارێکی دیکە ناچیتەوە دیداری ئەم دونیا کاتیە بەڵام دونیاکەی تر هەمیشەییە، بیربکەوە هەموومان دەچینەوە لای پەروەرێن. (نەتوانی ئەو بڕوانامەیە بەدەست بێنیت کە ئامانجی گەورەی ژیانت بوو؟ یان ئەو نمرەی کەخۆت دەتویست؟ خەم مەخۆ دڵنیابە ئەوەی خودا دەیکاتە قسمەتت باشترینە بۆت، ڕەنگە زۆر هەوڵت بۆی دابێت بەڵام ئەوەی کەبۆت بووە، هەر ئەوە سەرکەوتنی تۆیە ئەوانە و چەندەها ناخۆشی تر ئێمە لەو ژینەدا دەژین ئەگەر ئازار نەچێژین چێژ لە خۆشیەکان وەرناگرین هەموومان دەبێت خۆشی و ناخۆشی ببینین وە لە هەردوو باروودۆخدا دەبێت سوپاسگوزاری خودای گەورە بین.

هەروەك پێشووتر باسمان کرد ئەم ژیانە شوێنی تاقیکردنەوەیە بەخۆشی و ناخۆشییەکان بۆیە کاتێك تووشی ناخۆشی و ئازار دەبین پێویستە ئارامگر بیت وە لەسەر ئەم باروودۆخەی تێکەوتووی سوپاس گوزاری پەروەرێنی بەتوانا بیت ئەوکات لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو

دەبیت وە خودای گەورە گوناح و تاوانەکانت کەمدەکاتەوە. سەرەڕای هەموو ئەوانەش خودای گەورە پاداشتت دەکات و بەخێر و چاکە بۆتی هەژمار دەکات خەڵکی لەم سەردەمەدا زۆر ئاوەڕ لە ڕابردوویان دەدەنەوە بەڵام بە لایەنە نەرێنییەکەی چۆن؟ لە ڕابردوو ناخۆشیەکی هەبووە، تاوەکو ئێستاش خەمی بۆ دەخوات وەك ئەوەی تا مردن ئەم خەمە لەگەڵیدا بێت بەم جۆرە دەبێتە هۆی لەناوچوونی تەواوی ژیانی واتا هەمیشە خەمبارە، بەردەوام بیر لە رابردوو دەکاتەوە گومانی خراپ دێتە دڵ و مێشکی، لەڕووی جەستەوە ناتەندروست دەبێت، دەبێتە مرۆڤێکی گۆشەگیر، وەهەمیشە ترسی هەیە ،هەموو ئەوانە کاریگەری لەسەر ژیانی ئێستاو داهاتووی دەبێت کەواتە وەرن با بەلایەنی ئەرێنی سەیری ڕابردوومان بکەین گشت ئازار و ناخۆشیەکان بکەینە سەرچاوەی ئەزموونەکان وە هۆکاری چێژ بینین لە خۆشیەکان، هەمووومان خاوەن دڵ و دەروونێکی جوان و پاکین خودا بە ئەمانەت پێی بەخشیوین لەسەر ئێمە پێویستە بەپاکی و بەهێزی بیپارێزین و بیگەڕێنینەوە بۆلای پەروەرێن ئاخر بۆ لەبەر مرۆڤەکان و ئازار و تاڵی و ناخۆشییەکانی ڕابردوومان ئەم دڵ و دەروونە پڕبکەین لە پەڵەی ڕەش؟ یاخوود دەروونمان وێران بکەین؟ خۆشییەکانی ئێستا و ئامانجە گەورەکانی داهاتوومان بۆ دەبێت بە ناخۆشی و ئازارەکانی ڕابردوو ببەستینەوە؟ لە

ژیاندا دوو وشەی مەترسیدار هەن بە گوتنیان تەنها کات بەڕێدەکەین (بریا، خۆزگە) لەڕووی ماناوە جیاوازیان نییە بەڵام وشەی (بریا) زیاتر بۆ ڕابردوو بەکاردێت. (بریا بە ئۆتۆمبێلەکەم نەچووبام بۆ دەرەوە ئەوکات تووشی ڕووداو نەدەبووم). (بریا وام نەکردبا، بریا، بریا، بریا ..) بریا وشەیەکی مانا بەتاڵە چونکە بە گوتنی هیچ لەڕاستی ژیان ناگۆڕێت، گرینگترین شت کە پێویستە بەرلەوەی بڕیارێك بدەین یان کارێك ئەنجام بدەین سەرەتا بیر بکەینەوە تاوەکو دواتر توشی پەشیمانی و ئازار و خەم نەبین وتەیەك لەم بارەیەوە هەیە دەڵێت: (رابردووت لەبیربێت و پلانت بۆ داهاتوو هەبێت، بەڵام بۆ ئەمڕۆت بژی چونکە دوێنێ ڕۆیی، بەیانیش لەوانەیە هەرگیز نەیەت) "لۆك" گەورەترین ترس کە زۆرینەی مرۆڤەکان تووشی دەبن بۆ داهاتووە لەکاتێکدا نازانین لەداهاتوودا چی ڕوودەدات، هەر ئەو ترسە وامان لێدەکات کەتووشی دڵەڕاوکێ بین، بەجۆرێك بیرلەوە دەکەینەوە ئاخۆ لە داهاتوو چی ڕوودەدات؟ دەی هاوڕێ دووبارە پرسیارێك دەکەین، تۆ دەترسێیت لەداهاتوو؟ ئەی باشە زۆر دڵنیایت کە دوای چەند چرکەیەك ڕۆحت لەجەستەدا دەمێنێت؟! بیربکەوە ئایا بەڕاستی داهاتوو شایانی ئەو ترسەیە؟ باشە وادابنێ تۆ ئەمڕۆت بەترس بەڕێکرد ترست هەیە لەوەی بەیانی چی ڕوودەدات؟ ئەی ئەگەر بەیانی قسمەتی تۆ نەبوو؟! ئەوکات ئەمڕۆش و

تەواوی ژیانت لەدەست دەچێت، هیچ نەبێت ئەوکاتەی تێیدا دەژیت با چێژیی لێوەربگریت، خودای بەخشندە و میهرەبان گەورەترین بەخششی بەئێمەی بوونەوەرداوە ئەویش نازانین کەمێکی تر چی ڕوودەدات بیربکەوە ئەگەر زانیاریمان هەبا لەسەر داهاتوو بەتایبەتی بمانزانیبا کەی دەمرین، هەرگیز چێژمان لەژیان نەدەبینی هیچ خۆشیەکیش بوونی نەدەبوو، ئەوەش یەکێکە لە نیعمەتەکانی پەروەردگار بۆ بەندەکانی تاوەکو بێ هێز نەبین و نەترسین تووشی دڵەڕاوکێ نەبین، چێژ لەژیان وەربگرین کۆڵنەدەین.

دووبارە باسی وشە بەتاڵەکە دەکەین (خۆزگە) ئەوەش بە گوتنی هیچ لە ڕاستییەکانی ژیانت ناگۆڕێت ماندوو نابییت لەوەی بڵێی خۆزگە دەوڵەمەندبم، خۆزگە بڕوانامەی بەرزتر بەدەست بێنم، خۆزگە بەناوبانگ بم، خۆزگە ئاواتەکەم بێتەدی هتد.. بێزار نابیت؟ بێگومان زۆر بێ مانایە هەمیشە شتانێك بڵێ کە سوودت پێ نەگەیەنێت تەنها خووت پێوە گرتبێت، لە ژیانت هەمیشە بەم جۆرە بژی بڵێ ئەمڕۆ کۆتا دەرفەتە، بۆیە چی باش و بەسوودە ئەنجامی بدە هەموو ڕۆژێك بەمشێوەیە بیربکەوە دڵنیابە دەبیتە مرۆڤێك هەموو چرکە ساتەکانت پڕ چێژ دەبێت دەچیتە لوتکەی سەرکەوتن لەبەرئەوەی دوێنێ ڕۆیی ناگەڕێتەوە بەیانیش

ڕەنگە قسمەتی تۆ نەبێت کەواتە ئەوەی لەدەستداوە لە ڕابردوو ئەمڕۆ هەوڵی بۆ بدە تاوەکوو بەدەستی بێنیت هەموو کات گومانی باشت هەبێت بۆ داهاتوو، قسەیەك زۆرباوە لەناو کۆمەڵگەی کوردی دەڵێن: (نیەتت باش بێت، خودا بە نیەتی دڵت دەکات) وە بەدڵنیایەوە گومانی خراپت هەبێت خراپترینەکان دێنە ڕێت ئەوەی ترست لێی هەیە ڕوودەدات، بۆیە با گومانی باشمان هەبێت تاوەکو باشترینەکان بێنە ڕێمان، با خۆمان بە دوور بگرین لە وشە بەتاڵ و لاوازەکان لەبڕی ئەوانە هەوڵدەین وانەیەك لە هەڵەکانمان وەربگرین وە بیانکەین بە هێزێك تاوەکوو داهاتومانی پێ ڕۆشن بکەین و ئازارەکان لە ڕابردوو جێ بهێڵین.

ئێستائامادەیت بچین بۆ تەوەرەی دواتر؟؟

(با ڕاستگۆیی بکەینە گەورەترین بەها بۆ ڕەنگدانەوەی ڕەوشتە بەرزەکانمان)

لە تەوەرەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە ئادەمیزاد جیاوازە، لەگەڵ بە تەنها وشەی مرۆڤ لەم تەوەرەیدا گەورەترین جیاوازی بەدی دەکەین لەنێوان ئادەمیزاد و مرۆڤ ئەویش ڕاستگۆییە، گومان لەوەدا نیە هەتاکو ئێستا چەندەها پێناسە و وشەی جوان لەبارەیەوە داڕێژراوە، نموونە زۆرە لەبارەی ڕاستگۆیی بەڵام ئەوانەی زۆر بەلامەوە سەرنجرکێش بوون دەیخەمەڕوو:

"تۆماس جیفرسۆن "(ڕاستگۆیی بەشی یەکەمی کتێبی زانابیە.).

"جوندیی بەغدادی" (حەقیقەتی ڕاستگۆیی ئەوەیە، کەلە هەستیارترین و گرنگترین شوێندا ڕاست قسە بکەیت، لەکاتێکدا ئەگەر درۆ بکەیت ڕزگارت دەبێت.)

ڕای خۆم سەبارەت بە ڕاستگۆیی: "کلیلی گەنجینەی ئارامییە".
سەیربکە هاوڕێ دووبارە دەگەڕێینەوە سەر تەوەری یەکەم کە باوەڕ بوو، باوەڕ گەورەترین هێزە کەڕێگە نادات ئادەمیزاد لە ڕاستییەکان لابدات بەم جۆرەش ڕەوشتە بەرزەکانی ئینسانیەت ڕەنگ دەداتەوە لە

کەسایەتیدا وە ئارامی دڵ و دەروون بەدەست دێنیت. ڕاستگۆیی و ڕەوشت بەرزی دوو بەهای بەیەکەوە بەستراون، ڕاستگۆکان خاوەن ڕەوشتی بەرزن کەواتە یەکێك لە گەورەترین بەهاکان کە کەسایەتی مرۆڤ دیاری دەکات ڕاستگۆییە لە دیارترین ڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤ(ڕێزگرتن و گیانی لێبووردەیی، چاکەکردن، گوفتاری شیرین) ئەوانە لە بەها و ڕەوشتە جوانەکانی باوەڕدارانن ویستی ئەوەم هەبوو هەریەکەیان لە تەوەری جیاوازدا باس بکەم بەڵام وام بەباش زانی هەموویان بخەمە یەك تەوەرەوە لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی لێك نەپچڕاو لەنێوانیان بەدی دەکەم کەلە ئەنجامی ڕاستگۆیی دەبێتە ڕەنگدانەوەی کەسایەتی.

ڕێزگرتن: ئێمەی ئادەمیزاد دەبێت ڕێز لە بوونی یەکتر بگرین لەبەرئەوەی خودا ڕێزی لێناوین، خودای گەورە دەفەرمووێت: "وَلَقَد كَرَمنا بَنيى آدَم" واتا: ئێمە کەرامەتمان بە ئادەمیزاد داوە. ئەوەی ڕێزلە بەرامبەرەکەی بگرێت ئەوا ڕێزی لەخۆی گرتووە بەر لە هەمووشت مرۆڤ دەبێت ڕێز لە بوونی خۆی بگرێت بۆ ئەمەش دەبێت ڕێزی بەرامبەر بگریت. لێرەدا دەپرسیت ئەی چی ئەگەر ڕێز لە بەرامبەرەکەم بگرم بەڵام ئەو هیچ نرخێك بۆمن دانەنێت؟ ڕاستە ئەم سەردەمەی ئەمڕۆ بەشی زۆری بەم

شێوەیە، بەڵام لەپێناو کەسایەتی و ڕەوشتە بەرزەکانت ڕێز لە بەرامبەرەکەت بگرە بەداخەوە رەنگە زۆرێکیان نرخ بۆ ئەم ڕێزە دانەنێن. لێت تێدەگەم هاوڕێ بەڵام چارەسەر بۆئەمەش هەیە، تۆ بەردەوامبە لەسەر ئەم ڕەوشتە بە نرخەت بەردەوام ڕێز بنوێنە، ڕەنگە رۆژێك لە رۆژان تاوێك بەخۆیاندا بچنەوە ئەگەریش هەر بەردەوام بوون لە بێڕێزی هەوڵبدە لێیان دووربکەویتەوە بەڵام هەرگیز ڕێگە نەدەی بچیتە سەر ڕێبازی ئەوان، ئێمەی ئادەمیزاد لەئاست دەسەڵات و گەورەیی پەروەردگار زۆر نزمترین بەڵام پەروەردگار ڕێزێکی یەکجار زۆری لە ئێمەی ئادەمیزاد ناوە، بیربکەوە خودایەك بەو هەموو هێز و دەسەڵات و گەورەییەی ئێمەی وا بەنرخ داناوە و ڕێزی لێگرتووین لە زیندەوەران پلەی مرۆڤبوونی پێ بەخشین لە مرۆڤیش پلەی ئادەمیزادی پێ داوین وە هەموو دروستکراوەکانی بۆ خزمەتی ئێمە بە دیهێناوە، وە باشترینەکان بۆ ژیانمان بڕیار دەدات سەرەڕای هەموو ئەمانە بۆچی لامان شەرمە ڕێز لە بچوکتر لە خۆمان بگرین؟ ئەگەر بە ژیانی خۆماندا بچینەوە دەزانین هۆکاری نەمانی بەختەوەری و دڵخۆشی و کامەرانیە، لە ئەنجامی بیرکردنەوە و بڕیارە ناپەسندەکانی خۆمان بووە، کاتێك ڕەفتارەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمە دەبینم توشی سەرسوڕمان دەبم. ئاخر خودایەك ئەو هەموو ڕێزە لە بەندەی خۆی دەگرێت کە بەدی هێنا بەڵام مرۆڤەکان

ژیانی خۆشیان بەدەست نییە کەچی ڕێز لە یەکتری ناگرن لوت بەرزی بۆتە بەرزی کەسایەتی، مرۆڤی ناپەسند وا بیردەکاتەوە، ( کەسایەتی ودەوڵەمەندی و لوت بەرزی وجوانی و بڕوانامەی بەرزو زیرەکی وکەشخەیی، هتد.) هەموو ئەوانە دەبنە خاوەن کەسایەتی بەرز یاخود سەقافەتی بە رز، لەراستیدا ئەمە بە شێکە لەگومرایی کە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە توشی بوونە هەرچیەکیش بەدەستی دێنن قەناعەتیان پێی نییە. هەمیشە دەیانەوێت کارێك بکەن تاوەکو گەورەتر لە مرۆڤی دیکە دەرکەون. ئەزیزم، ئەوە خۆتیت بڕیار دەدەیت کە بەختەوەر بیت، لێرەوە بەڵێن بدە کە ڕێز لە (خودا، دواتر پێغەمبەران، کتێبە ئاسمانیەکان ئاینیە جیاوازەکان، بوونی خۆت، گەورەتر و بچووکتر لەخۆت، دەوڵەمەند و هەژار و بێ جیاوازیی، لە زانست لە ئامۆژگارییەکان لە کارەکەت تەنانەت ئاژەڵ و ڕووەکیش لەبەرئەوەی بەشی زۆری ژیانت لەسەر ئاژەڵ و ڕووەکە).

لێبووردەیی، باوەڕدار دەبێت لێبووردەبێت وە ئارامگربێت لەبەرامبەر تاڵیەکان وە باروودۆخە جیاوازەکان بەداخەوە خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە کەسێك کە بەخشەر بوو ئەوا ترسنۆکە یاخود کەسایەتی نزمە، دووبارە دەڵێین ئەوانە کەسانی ناپەسەندن کە بەم جۆرە بیردەکەنەوە ، ئەوە بزانە

بەخشەر چاکەکارە تۆ بە جۆرێك بژی بەختەوەری و ئاسوودەیی دڵ و دەروون بەدەست بێنیت گوێ مەدە بەوەی خەڵك چۆن بیردەکەنەوە لەبەرئەوەی خودای گەورە و بەتوانا فێری کردووین کە لێبووردەبین. هەمووامان تاوان دەکەین دەکەوینە داوی شەیتان وە لەڕێی ڕاست لادەدەین بەڵام کە داوای بەخشین دەکەین خودا دەمانبەخشێت، کەچی سەیری مرۆڤەکان بکە هەمیشە باشبە لەگەڵیان بەڵام یەك هەڵەت کرد ئیتر تەواو دەتسڕنەوە لە ژیان ناتبەخشن خودا بە گەورەیی خۆیی لە مرۆڤ خۆش دەبێت کە داوای بەخشین دەکات کەچی مرۆڤ لە مرۆڤی بەرامبەر خۆشی نابێت، وتەیەکی زۆر جوان هەیە دەڵێت:( داوای لێبووردن کردن هەمووکات مانای ئەوە ناگەیەنێت کەتۆ هەڵەیی و کەسی بەرامبەر درووستە، تەنیا مانای ئەوەیە کە پەیوەندی نێوانتان بە گەورەتر لەخۆت دەزانیت) "نە زانراو" کەوایە هەرکە هەڵەیەکمان کرد با داوای لێبووردن بکەین مەرجییش نیە هەڵەکە لای ئێمە بێت بەڵام با دەست پێشخەربین لەبەربوونی مرۆڤایەتی.

گوفتاری جوان: زمان پارچەیەکی جەستەیە لەڕێیەوە مرۆڤەکان پەیوەندیەکان ئاڵوگۆڕ دەکەن، وە ڕۆڵی گەورەی هەیە لە درووست بوونی کەسایەتی، مرۆڤی باوەڕدار خاوەن زمانی شیرین و گوفتاری

جوانە وە زمانی دەگێڕێت بەو لایەنەی کە خەڵك خۆشیان بوێت، لەخەمی کەسانی تر کەمبکاتەوە وە دڵی کەسانی دیکە خۆش بکات، وە مامەڵەی سوودمەندی پێبکات، وە متمانەی خەڵکی پێ بەدەست بێنێت وەلەکاتی پێویستدا بتوانیت باوەڕ بە کەسی بەرامبەر بێنیت. کەواتە ئێمەی ئادەمیزاد لە ڕێگەی گوفتارەوە دەتوانین وابکەین خەڵك خۆشمانی بوێت یان ڕقیان لێمان بێت. کەواتە بیربکەوە و بڕیاربدە بۆچی زمانێك خودا پێی داوین لەکاری خێر و چاکە و درووست بوونی کەسایەتیەکی بەرز بەکاری نەهێنین؟ چی لەتۆ کەمدەبێتەوە ئەگەر بەکاری بێنیت؟ چی دەبێت ئەگەر گوفتارمان وەك هەنگوین شیرین بێت؟ دڵی خەڵکی بە زمانە شیرینەکەت خۆشبکەیت؟ با واز لەوە بێنین لەوەی هێندە بڵێین: خەڵك وا نییە لەگەڵ ئێمە کەواتە بۆ ئێمە وابین، زۆر باشە بیرلەوەبکەوە تۆ دەتەوێت وەك ئەوان لە دەروونی و نائارام و ژیانی پڕ لە ڕق و کینە بژیت؟ دەتەوێت لەفەرمانی خودا دەربچیت؟ خەڵکی ڕقیان لێت بێت؟ هاوڕێی شیرینم ئەم ژیانە زۆر سنووردارە، تەمەنێك لە خۆشەویستی دۆستانی تێرنەبێت چ ژیانێك بەرێدەکەین پڕ لە ناخۆشی و نائارامی و ڕق وکینە لەکاتێکدا بە تەنها بە یەك وشە بتوانی دڵی خەڵکانێك خۆش بکەیت هەست بە بوونی مرۆڤایەتی بکەن چ شتێك بەقەد دڵخۆشکردنی خەڵکانی دیکە دەروونت ئارام دەکات، ئەو کاتەی

بە گوتنی چەند وشەیەکی جوان دڵی موسوڵمانێك خۆش دەکەیت خوداش تۆ دڵخۆش دەکات، ،هەریەك لە بەها بەرزەکان (ڕێزگرتن، لێبووردەیی، گوفتاری جوان) خودی چاکەیە، لەبەرئەوە هەر ڕەوشتەك و بەهایەکی جوانی مرۆڤایەتیە، کەواتە ئەگەر سەرنج بدەینە ڕەوشت و بەها مرۆڤایەتیەکان، دەبینین کە کەسایەتی بە مرۆڤ دەدات، وە ئارامی دەروونی پێدەدات، خوداش لێی ڕازیە سەرباری هەموو ئەمانەش بە چاکە بۆی هەژمار دەکرێت کەواتە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کەوا ڕاستگۆیی سەرچاوەی هەموو ئاکارە مرۆڤایەتیەکانە.

پێغەمبەری خودا (د.خ) "بە سادق ئەمین" ناسرا بوو واتا: ڕاستگۆ، لە دیارتریین سیفەتە جوانەکانی مرۆڤە. بۆیە مرۆڤی ڕاستگۆ لەلای خەڵکی ڕێزدارە وە خوداش لێی ڕازیە، خاوەن کەسایەتیە، خاوەن متمانەی خەڵکە، سەرکەوتووە، چاکەکارە هتد.. دووبارە دێینەوە سەر هەمان ئەو پرسیارەی کە دەڵێن: بۆچی ئێمە ڕاستگۆ بین لەکاتێکدا کەسانی دەوروبەرمان ناڕاست بن لەگەڵماندا؟ خۆی ئەوە ڕاستە ،کەم مرۆڤ هەن لەڕاستیەکان لانەدەن بەڵام لێرەدا مەبەستێك هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئێمە بۆ خودا دەژین وە بەدەستهێنانی بەختەوەری خوداش ڕاستگۆی خۆش دەوێت چونکە مرۆڤی ڕاستگۆ خاوەن ڕەوشتی بەرزە لەبەرئەوە با

هەوڵدەین لەگەڵ هەموو کەس ڕاستگۆبین تاوەکو خودای بەرز و بەدەسەڵات لێمان ڕازی بێت (ڕاستگۆیی سەرچاوەی باوەڕە) باوەڕدار دەبێت ڕاستگۆ بێت تاوەکو تووشی هیچ هەڵەیەك نەبێت لەهەمان کاتدا لادان لە ڕاستیەکان واتای ئەوەیە تۆ هاوەڵ بۆ خودا بڕیار دەدەیت، خودا ئەو مرۆڤەی خۆش ناوێت کە هاوەڵی بۆ بڕیار دەدات، دواجار بڕیاربدە دەتوانیت بۆ هەمیشە ببیت بە مرۆڤێکی ڕاستگۆ کە ئادەمیزادی ناوە؟

## دڵخۆشکردنی کەسانی تر

**دڵخۆشکردنی کەسانی دەورووبەرمان بەر لە خۆمان..**

ئێمە دەمانەوێت هەمیشە دڵخۆش بین لەم ژیانە هەموو هەوڵێکمان بۆ دڵخۆشی بوونمانە دڵخۆشی هەستێکی ناوەکیە ناتوانین لە ڕوکەشدا خۆمان دڵخۆش بکەین، چونکە ناخمان نەبۆتە بەرهەمهێنی خۆشییەکان زۆرینەی مرۆڤەکان بوونی پارە وماڵ و سامان بە سەرچاوەی بەختەوەری دەزانن لەبەرئەوە زۆرینەی کاتەکانیان بۆ باشتر کردنی باری دارایی تەرخان دەکات، تەنانەت ئەوەی کە لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا زۆر دەبیندرێ مرۆڤەکان لەبەر ڕاکردن بەدوای پارەدا خۆیان لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیش لادەدەن، هەر لەبەرئەوەش دەبینین پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان زۆر کاڵ بۆتەوە، یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو لەناوچوون دەبات زۆری بەکارهێنانی سۆشیاڵ میدیایە. لەبەرئەوە لە کۆمە ڵگاکەمان لێکترازانی پەیوەندییەکان و نەمانی خزمایەتی وە کەمبوونەوی هەستی مرۆڤایەتی زۆر بە زەقی تێدا دەبیندرێت، تا ئێستا چۆن بتوانین دڵخۆشبین؟ ئەی چی سەبارەت بەو هەموو کێشە و گیر و گرفتانەی ژیان ؟ بەڵی ئێوە ئێستا وا بیر دەکەنەوە کە لەم سەردەمەدا کێشە گەلێکی زۆر هەن وە کە

باسی دڵخۆشی دەکەین کۆمەڵێك کێشە و گرفتەکانی خۆتان دەخەنە ڕوو. وەك ئەوەی کە دەڵێن: (من خاوەن خێزانم کەچی تاوەکو ئێستا خانوویەکم نییە دەبێت هەموو مانگێك کرێی خانوو بدەم، نا من زۆر خەم دەخۆم هەمیشە کاردەکەم بەڵام پارەکە بەشی خەرجیماڵەکەم ناکات ،خێزانەکەم هیچ گرنگی تەواوم پێ نادات ،هەستدەکەم نەمتوانیوە پەروەردەیەکی باشی منداڵەکەم بکەم ،زۆر خەم دەخۆم کە دەبینم هاوڕێکانم ئۆتۆمبێلیان هەیە من نیمە، ڕۆژانە پێویستە کۆمەڵێك حەب و دەرمان بەکاربێنم تاکو ڕوبەڕووی نەخۆشییەکەم ببمەوە، خێزانەکەم ڕێگەم پێ نادەن بیرۆکەکانم بخەمەروو کەس لێم ناپرسێت ئامانجت چییە؟ خێزانەکەم پشتگیریم ناکەن لەکارەکەمدا وە زۆر جار دەبنە ڕێگر لەبەردەم ویست و ئارەزووەکانم ، ئاشقی کەسێك بووم بریارمان دابوو زەواج بکەین کەچی حیانەتی لێمکرد ،هاوڕێەکەم چۆتە زانکۆیەکی تایبەت منیش دەمەوێت بچم بەڵام پارەم نیە پیاوەکەم تاوەکو ئێستا دیاری بۆم نەکڕیوە وە لە ڕۆژانی بەتاڵیمدا نەیبردووم بۆ ژەمێك نانخواردن ، هاورێکەم هەمیشە بەقسە ڕەقەکانی تورەم دەکات).

سەرەڕای هەموو ئەوانە ئاخۆ چ هۆکارێك هەیە تاکو دڵخۆشبین؟ بەڵێ هاوڕێکەم ئەمانە کۆمەڵێك کێشە و گیر و گرفتن کە دەکرێ هەریەك لە ئێمەی مرۆڤ لە ژیاندا هەمانبێت لەم ژیانەدا هیچ مرۆڤێك بێ کێشە نییە وەرە من ئامۆژگاریەکی بچوکت دەکەم دڵنیام سودی دەبێت (خۆزگە بەژیانی هیچ کەس مەخوازە، ئەگەر ژیانی ئەو شایستەی تۆبا خودا خۆی پێتی دەبەخشی) کەواتە هەمیشە ڕازی بە بەوەی کە ڕوودەدات لەبەرئەوەی خودای گەورە باشترینەکان بۆتۆی ئادەمیزاد بریار دەدات، کەواتە ئێستا بۆماوەی چەند خولەکێك بیربکەوە سەرەڕای ئەو هەموو گرفتانەی ژیان کە باسمان کرد چی بکەین تاکو دڵخۆشبین؟

وەرە ئەزیزەکەم بەیەکەوە باسی سەرچاوەی دڵخۆشی بکەین، هەر وەك لە سەرەتادا باسمان کرد دڵخۆشی هەستێکی ناوەکییە کەواتە دەبێت لەناخەوە هەست بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی بکەین وە ئاگاداربە هاوڕێ شیرینەکەم وا بیرنەکەیتەوە بەبێ کێشە و گرفتەکان تۆ دڵخۆشی ئەگەر وا بیردەکەیتەوە ئەوا هەڵەیت لەبەرئەوەی سەرچاوەی گەورەی دڵخۆشی بیرو باوەڕ و بوونی مرۆڤایەتییە.

کەواتە دەبێت گرنگی بە مرۆڤەکانی دەوروبەرمان بدەین، چیمان بۆخۆمان پێ خۆش بێت وە باش بێت دەبێت بۆ ئەوانیش پێمان خۆش

و باشبێت. هەرگیز وا بیرمەکەوە کە دەوروبەرت دڵتەنگ بکەیت خۆت دڵخۆشبیت ئەو بکەوێت تۆ سەرکەوتووبیت ئەم بیرکردنەوە دوورە لە مرۆڤی باوەڕدار .

تاقیبکەوە کاتێك خەڵکی بەهۆی قسە خۆشەکانت، زەردەخەنەکانت وە پێکەنینەکانت وە بە کردەوە جوانەکانت هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی دەکەن، وە بەهۆی تۆ خەم و کێشەکانیان بیردەچێتەوە ئەوکات خودای گەورە دڵخۆشی دەخاتە ناختەوە تەنانەت زۆر جار نازانی هۆی ئەم دڵخۆشیە چیە؟ کەواتە دەکرێت سەرەڕای هەبوونی کێشە و گیر و گرفتەکان یەکتر دڵخۆش بکەین لەبەرئەوە با نەوەستین لە ئەنجامدانی ئەم ئاکارە جوانانە، زەردەخەنە بکە، پێبکەنە، با هەمیشە ڕوخسارە جوانەکانت بدرەوشێنەوە، باش بە، بەڕێز بە، گوفتارت شیرین بکە. دڵنیابە بەم جۆرە هەمیشە تۆ دڵخۆشیت. وتەیەکی زۆر جوان هەیە دەڵێت: "قسەی خۆش ئامان و کورتە بۆ گوتن بەڵام کاریگەرییان بەڕاستی بێکۆتاییە" (تێرییسا)

کەواتە با هەمیشە زمان شیرین بین خۆ ئەگەر بەرامبەرەکەمان بەهۆی ئێمەوە جا زەردەخەنەکانمان یان گوفتارە جوانەکانمان یان ڕوخساری درەوشاوەمان . دڵخۆش بن هیچ لەئێمە کەم نابێتەوە بەڵکوو خودا بە

چاكە بۆمانی دەنووسێت وە لە هەمان كاتیشدا دڵخۆشی و كامەرانی ڕوومان تێدەكات.

بیرمە ڕۆژێك لەڕۆژان تەمەنم (١٥) ساڵان بوو لەگەڵ خێزانەكەم بۆ گەشت چووینە دەرەوە لەكاتی گەڕانەوە لە ترافیك وەستاین لەو كاتەدا من سەرنجی دەرەوەم دەدا لەناكاو سەرنجم كەوتە سەر منداڵێك كە لە لێواری شەقامدا زۆر داماو و خەمبار دانیشتبوو كۆمەڵێك شیرینی لابوو كەپێوەی دیاربوو بژێوی ژیانی لەسەر ئەم كارەبوو بەڵام داماوی ئەو منداڵە زۆری هەستی جوڵاندم لەبەرئەوەی شیرینیەكەی بۆ نەدەفرۆشرا دڵتەنگ و خەمبار بوو بەڵام لەناكاو ئۆتۆمبێلێكی مۆدێل بەرزەكان وەستاوە بانگی منداڵەكەی كرد زۆر پەرۆش بووم بۆئەوەی بزانم چی ڕوودەدات لە دوورەوە بینیم پیاوێك لەناو ئۆتۆمبێڵەكە بوو ئەو پیاوە لەگەڵ منداڵەكە دەدوا نەم دەزانی باسی چی دەكەن ، بەڵام منداڵەكە بە كەیف خۆشی دەدوا لەگەڵی وە ئەم پیاوە هەموو شیرینیەكانی لە منداڵەكە كڕی ئەوەی من بینیم ئەم بڕە پارەیەی كە بە منداڵەكەیدا زۆر لە شیرنەمەنیەكان زیاتربوو منداڵەكە لە خۆشیاندا نەیدەزانی چۆن هەستی خۆی دەربڕێت، بەڕاستی ئەم شەوە ئەم دیمەنە زۆر هەستی جوڵاندم دڵخۆشكردنی كەسێك چەندە بەهایەكی بەرز و پیرۆزە، ئێستا

بۆچوونی تۆ چییە؟ ئامادەیت زۆرترین کەس دڵخۆش بکەیت؟ ئەگەر هێشتا دوو دڵی لە بڕیاردان با سەرنج بدەین بۆ هەندێك لە بەڵگەکان پێغەمبەرمان (د.خ )دەفەرمووێت(قَالَ اللُه عَزَّ وَجَلَّ أَنْفِقْ أُنْفِقَ عَلَيْكَ) (١٨٧٦-ل ٣٢٨) واتا: خودای گەورە جل جلالە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم ماڵ ببەخشە و بە چەندان قات پێت دەبەخشمەوە. کەواتە ئەگەر لەم فەرموودەیەدا وردبینەوە ڕوونە کە هەرشتێ ببەخشین بەچاکە خودای گەورە زیاترمان بۆ دەخاتەوە شوێنی. دەی کە ئێمە خۆشی ببەخشین بە مرۆڤەکانی دەوروبەرمان خودای گەورە زیاتر ئێمە دڵخۆش دەکات بێگومان ئێمەی مرۆڤ هەریەکەمان خاوەن دڵین خاوەن هەست و سۆزین بۆیە زۆر جار لەلایەن مرۆڤەکانی بەرامبەرمان شکێندراوین وە ڕووخاوین زۆر جار بەجۆرێك دڵمان شکێندراوە کە نامانەوێت لە هیچ مرۆڤێك نزیك بینەوە لەبەرئەوەی وا هەست دەکەین هەمووان دەمانروخێنن دەمانشکێنن هەستەکانمان لەناودەبەن.

ئەزیزەکەم، وامەزانە تەنها منداڵەکان دڵیان دەشکێت بەڵکو هەرزەکار و گەنجەکان زۆر هەستیارترن لەڕووی هەست و سۆزەکانیان وە بە تەمەنەکانیش وەك منداڵ دڵیان ناسکە بۆیە پێویستە ڕێز لە بڕیاری

هەموو کەسێك بگرین بۆیە با هەوڵدەین لەڕۆژێکدا زۆرترین کەس
دڵخۆش بکەین خەندە بخەینە سەر لێوی هاوڕێکانمان خێزانەکانمان
خزم و نزیکەکانمان. ڕێگایەکی دیکە بۆ دڵخۆشکردنی خۆشەویست و
ئەزیزانت بردنی دیارییە بۆیان دڵنیام ئەم هەستە خۆشەت تاقیکردۆتەوە
کاتێك هاوڕێ خۆشەویستەکەت ڕۆژی لەدایك بوونیەتی تۆش دیاریت
بۆ کڕیوە کاتێك هاوڕێکەت دیاریەکەی بینیوە چەندە هەستی
بەدڵخۆشی کردووە نەك هەر لەبەر دیاریەکە بەڵکو هەست بەوە دەکات
کە کەسێ هەیە و گرنگی پێدەدات یاخود زۆر جار زویر بوون ڕوودەدات
لەنێوان مرۆڤەکاندا کەچی بەبردنی دیارییەك بۆیان ئاشت دەبنەوە و
هیچیان لەبەر دڵ نامێنێت پێغەمبە رمان د.خ دەفەرموێت(تَهَادُّواْ
تَحَابُّواْ) (٢٧٦٠ ل ٤٥٥) واتا: هەدیە و دیاری بۆ یەکتر بەرن چونکە
بەهۆیەوە خۆشەویستیتان زیاد دەبێت کەواتە ئێمەی ئادەمیزاد
دەتوانین بەهەریەك لە رەوتی جوانمان، گوفتاری شیرینمان، زەردەخەنە
و پێکەنینەکانمان سەردانی کردن و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان وە دیاری
کڕین وبەخشین هتد..دەتوانین دڵی یەکتر خۆش بکەین کەواتە با
هەوڵدەین هەمیشە خەڵکی دڵخۆش بکەین بیان خەینە پێکەنین
هاوبەشی خەمەکانیان بین وە ئازار و خزمەکانیان لەبیربەرینەوە بابیین بە
ئادەمیزاد مرۆڤایەتی پەیڕەو بکەین ئەوسا ژیانێك دەژین پڕ خۆشی و

کامەرانی بۆخۆمان و هەموو مرۆڤایەتی وە خودای گەورەش هەمیشە ڕەحمەتی خۆیمان بەسەردا دەبارێنێت.

دەمەوێت باسی کەسایەتیەکی گەورەتان بۆ بکەم، (علی بەنات) گەنجێکی ئوستوڕاڵی بوو ڕۆژێك دەچێت بۆلای پزیشك وە پشکنینی بۆ دەکرێت دەردەکەوێت توشی شێرپەنجە بووە وە شێرپەنجەکەی ژمارە چوارە کە ژمارەکەی زۆر مەترسیدارە ، پزیشك پێ یدەڵێت: شەشی مانگی دیکە دەژیت وە علی بەنات یەکێکە لە گەنجە دەوڵەمەندەکانی ئوستوڕاڵیا کە هەر شتێك بە پارە بکرایە ئەو دەیتوانی بیکات بەڵام کاتێك زانی شێرپەنجەیەتی وە تەنها شەش مانگی تر دەژیت نەچوو بە پارە و سامانەکەی خۆی چارەسەر بکات بەڵکو لەبڕی چارەسەری جەستەی چوو چارەسەری دڵی بکات چۆن؟ بەجۆرێك چوو بۆ وڵاتی ئەفریقیا هەموو ماڵ و سامانەکەی بەخشی بە منداڵە فەقیر و هەژارەکانی ئەفریقیا کە هەمووی لە کردنەوەی نەخۆشخانە و قوتابخانە و پێویستیەکانی ئەوێدا بەخشی، کاتێك لێیان پرسی ئۆتۆمبێڵە فیراریەکەت چەند بەنرخەلای تۆ کە نرخەکەی ٦٦ دەفتەر دۆلارە؟ لە وەڵامدا وتی: ئەم ئۆتۆمبێڵە لەلای من بە قەد پێکەنین و زەردەخەنەی منداڵێکی ئەفریقی لای من نرخی نیە، ئینجا خودای گەورە ماوەی دوو

ساڵ و نیو تەمەنی درێژکردەوە تاوەکو چی کاری خێرە بتوانێ ئەنجامی بدات وە ماڵ و سامانەکەی لەپێناو خودا ببەخشێت کاتێك کە مرد لە مانگی ڕەمەزاندا مرد وە مردنی ئەو نەك تەنها ئوستوڕاڵیا و ئەفریقیا بەڵکو هەموو جیهانی موسوڵمانانی هەژاند وە ئەو بە دڵێکی ئاسوودەوە مرد، بێگومان ئەوەیە دڵخۆشی و ئاسوودەیی کەواتە خۆشەویستانم بێگومان ئێمەش دەتوانین دڵی یەکتر خۆش بکەین وە مەرج نییە تەنها بە پارە زۆر شتی دیکە هەن کە دەتوانین دڵی کەسی بەرامبەرمانی پێ خۆش بکەین وەك ( زەردەخەنەی لێوانمان ،ڕوخساری گەش، قسەی خۆش، یارمەتییدان، هاندان، پشتگیری کردن، پێشنیارکردن، ستایشکردن، ڕێزگرتن، هتد..).

(بەرز ڕوانین)

سروشتی بوونەوەر بەم چەشن و جۆرەیە، دەیەوێت خاوەنی زۆرترین شت بێت لەم دونیایە . بەتایبەتی مرۆڤ تێر نابێت لەو شتەی خودا پێی دەدات چاوی لەوە زیاترە بە تایبەتی لە ڕووی (پارە و ماڵ و سامان و ئۆتۆمبێلی مۆدێل بەرز و خانوو جل و بەرگی جوان و ناوبانگ بوون هتد..) قسەیەك هەیە زۆر باوە دەڵێت: "بەشی خۆم بۆ خۆم، بەشی تۆش دەخۆم" زۆربەی مرۆڤەکان هەوڵدەدەن تاوەکو ببنە خاوەنی شتە دونیایەکان لە هەندێ کاتدا پێویستە بەرزتر لە خۆمان بڕوانین بەڵام لە چ شتانێك پێویستیان بە بەرز ڕوانینە؟ بێگومان سروشتی ئێمەی مرۆڤ ئاوایە، دەمانەوێت هەمیشە لە لوتکە بین ( لە دەوڵەمەندی ،لە بروانامە، لە کەسایەتی ، لە ماڵی دونیا ،لە ئامانجەکانمان هتد.) لەهەموو شتەکانی دونیا حەزمان لە لوتکەیە، بەڵام بەداخەوە کەم مرۆڤ هەیە بیەوێت لە خوداپەرستی لە لوتکە بێت، کە ئەمە هەموو سیفەتە باڵاکانی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە کە مرڤ لە دونیا و قیامەتدا دڵخۆش و سەرفراز و سەرکەوتوو دەکات، وەك لە تەوەرەکانی تریشدا باسمان کرد ئێمە زۆربەی شتەکانمان زارەکییە زۆر کەم کرداری پێ دەکەین، لێرەدا دووبارە دەگەڕێمەوە سەریەکێك لە وشە بەتاڵەکان ئەویش وشەی

خۆزگە زۆر جار دەڵێین: (خۆزگە) ئەو شتەم هەبا. خۆزگە ئەو شتە هی من دەبوو یان دەڵێن خۆزگەم بە ژیانی ئەو کەسە. خۆزگە منیش دەوڵەمەند بوومایە، خۆزگە منیش لەو ئۆتۆمبێلەم هەبووایە، خۆزگە منییش نمرەی بەرزم هێنابووایە، خۆزگە هاوسەرگیریم لەگەڵ فڵانە کەس کردبا خۆزگە دەبووم بە دکتۆر . خۆزگە .. خۆزگە .. هتد..

هەمیشە ئەو وشە بەتاڵە لە ژیانماندا بەکاردێنین بەڵام زۆر کەم لە ئێمە بەو جۆرەین کە کەسێکی باوەڕدار ببینی بڵێین خۆزگە منیش ئاوا باوەرەکەم بە هێز بووایە، ئەزیزەکانم زۆرینەی ئەو شتانەی ئێمە خۆزگەیان بۆ دەخوازین بە پارە و هەوڵدان دێنەدی بەڵام باوەڕ و پلەی ئیمان پێویستی بەهیچ لەمانە نییە ئەگەر بمانەوێت بەدەستی دێنین بەڵام ئێمە هەتا لە شەیتان نزیك بین دوورین لەخودا ئێمە بە خۆمان دەڵێن: موسوڵمان بەڵام ڕێژەیەکی کەم تێماندا هەیە کە موسوڵمانان و باوەڕداری ڕاستەقینە بێت کەواتە ئێمە لە ژیاندا خۆزگە بۆ شتانێکی بێ نرخ دەخوازین شتانێك کە کاتیە زۆرجار لە قوتابخانە لە زانکۆ لە شوێنە گشتیەکان لە ئاهەنگی لە میوانی لەو شوێنانەی کەلە خەڵك نزیك دەبین گوێ بیستی ئەو قسەیە دەبین کە دەڵێن خۆزگەم بە ژیانی فڵان یان خۆزگە  من لە شوێنی ئەو دەبووم ، دووبارە دەڵێم(خۆزگە بەژیانی

هیچ کەس مەخوازە، ئەگەر ژیانی ئەو شایستەی تۆبا خودا خۆی پێتی دەبەخشی.) کەواتە ئەزیزم ژیانی کەسی بەمجۆرە نیە کە تۆ لە ماوەیەکی کورتدا تەنها خۆشیەکەی دەبینیت، ئەگەر بێت و بۆ ماوەیەك بچیتە ناو ژیانی ئەو لەونەیە تۆ بەرگەی نەگریت چونکە لەم ژیانەدا مرۆڤەکان نابێت تەنها لە خۆشیدا بن هەمووومان دەبێت خۆشی و ناخۆشی ببینین، کەواتە بە زوویی بڕیار لەسەر ژیانی کەسانیتر مەدە وە خۆزگە بە ژیانی هیچ کەس مەخوازە لەوانەیە  شتانێك ئەو هەیەتی تۆ نیتە بەڵام لەوانەیە تۆ دڵخۆشیەکت هەبێت کە ئەو ئامادەیە هەموو ماڵ و سامانەکەی بدات بۆ ئەوەی ئەو خۆشیە بەدەستی بێنێت کەتۆ هەتە.
باشە لەوانەیە پرسیارێك بە خەیاڵتا دا بێت بڵێیت: ئێمە کە ماڵ و سامانی زۆرمان نەبێت وە ئۆتۆمبێلی جوان و هاوسەری جوان و بڕوانامەی بەرز و ئەو شتەی خۆمان دەمانەوێت وە ئامانجەکانمان هتد.. ئەگە ئەمانەمان نەبێت چۆن دەتوانین دڵخۆش بین؟ نا ئەزیزم ئێمە بە هەڵە لە هۆکاری بوونمان لەم ژیانە گەیشتووین ئێمە ناژین بۆئەوەی هەرچی ویستمان و ئارەزوومان بۆی هەبوو بەدەستی بێنین، بەڵکوو ئێمە لە تاقیکردنەوە داین هەموو شتەکانی دونیا کاتین ئەگەر دەوڵەمەندترین کەسی دونیاش بین کە مردین هەمووی جێ دێڵین جگە لە باوەڕەکەمان وە دینەکەمان وە ڕەوشت و سیفەتە جوانەکانمان وە ئەو کارە خێرانەی

که لە ژیاندا ئەنجاممان داوە، خۆ ئەگەر لەم ژیانەدا هیچ شتێکت نەبێت دەتوانیت باوەڕ و دینەکەت بکەیتە هەموو ماڵ و سامانت هەر دڵێك کە خۆشەویستی خودای تێدا بێت ئەو دڵە زۆر دەوڵەمەندە، خۆشەویستانم دەوڵەمەندی دڵ هەموو کەس ناتوانی ببێتە خاوەنی ، لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندی دڵ واتا دڵخۆشی و ئاسوودەیی و ئارامی خۆش ویستنی گشت ئادەمیزاد وە چێژبینین لە ژیان وهەوڵدان وئامانجدار بوون ورەوشتی جوان و خاوەن کەسایەتی سەرکەوتوو و بەهێزو هەست نەکردن بە ماندوویێتی و نزیك بوونمان لە خوداوخۆشەویستی خودا و ئەشقی پەروەردگاریی بەتوانا لە دونیا و قیامەتدا ڕەنگ دەداتەوە، ئەوکات دەبین بە ئادەمیزادێکی بەهێز و ڕێزلێگیراو لەناو خەڵکدا. خۆشەویستانم ئەگەر دەتانەوێت لە ژیاندا دڵخۆش بن بابۆ دینەکەمان و کاری چاکە و ڕەوشتی جوان و سیفەتە جوانەکانی ئیسلام و یارمەتیدانی خەڵك و ڕێز و خۆشەویستی و زانست و زانیاریی و هەموو ئەو شتانەی کە لە خودا نزیکمان دەکاتەوە و دەمانکات بە ئادەمیزاد هەوڵی بۆ بدەین. با لە هەمووئەو شتانە لە کەسانی لەخۆمان بەرزتر بڕوانین کە خاوەنی هەریەك لەمانەن وە کاتێ هەستت بە دڵتەنگی کرد بۆ شتانێکی دونیایی و کاتی، دەست بەجێ سوپاسی خودا بکە بڵێ من خاوەنی ڕوخسارێکی جوان و ڕێکم  دوو

چاوی سافم هەیە کە جوانی بەدیهێندراوەکانی خودای پێ دەبینم ، دوو گوێی ساغم هەیە کە قورئان و ناو و سیفەتە جوانەکانی خودای پێ دەبییستم و فەرمووده و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەرمان (د.خ ) پێ دەبیستم، لووتێکی ساغم هەیە کە بۆنی سروشتیی جوانی دونیای پێ دەکەم وە ئەو زمانەی کە زیکر خودای پێدەکەم، ئەو دەستانەی بۆ پاڕانەوە لە پەروەردگارم بەرزی دەکەومەوە وە ئەو دڵە پیرۆزەی کە خۆشەویستی پەروەردگارێکی میهرەبان و بە دەسەڵاتی تێدایە وە ئەو هەستەی کە ژیانمان لەلا جوانتر دەکات وە بەهێزمان دەکات وامان لێدەکات هەوڵدەین بۆ ئامانجەکانمان هتد.. کەواتە ئەزیزانم لەوە زیاتر چی؟ یانی با ئێمە ئەو هەموو شتە ببینین کە خودا پێی داوین، با ئەو هەموو شتە جوانانە ببینین کە خودا پێی داوین ، کە واتە هەتا خاوەنی ئەو هەموو شتە جوانە بین چ پێویست دەکات خۆمان بەکەم بزانین وە هەست بە دڵتەنگی بکەین، هەمیشە لە بەرزیی و پیرۆزیی پەروەردگار بڕوانین ئەزیزانم خودا ئێمەی زۆر خۆشدەوێت ئەو هەموو نیعمەتەی بە ئێمەداوە وە بەرز و پیرۆزیی ڕاگرتووین.

**چەند ئامۆژگارییەك:**

1- ڕاستگۆبە لادان لە راستی قبووڵ مەکە لەبەرئەوەی هەموو ئاینی ئیسلام و سیفەتەکانی لە ڕاستگۆیی سەرهەڵدەدات وە مرۆڤی ڕاستگۆ سەرکەوتووە.

2- هەرگیز کۆڵمەدە لە ژیان هەمیشە گومانی باشت هەبێت پشت بەمرۆڤەکان مەبەستە بوونی خودا بۆ هەموو شتێك بەسە.

3- بوێر بە (چاونەترس بە) تەنها لە خودا بترسە چونکە تەنها خودای گەورە باڵادەستە بەسەر هەموو شتێك.

4- هەمیشە لەسەر ڕێگای ڕاست برۆ و مەوەستە بەوشێوەیە ئامانجەکەت دێتە بوون.

5- دڵی مرۆڤەکان مەشکێنە کاتێك ویستت دڵی کەسێك بشکێنی خۆت بخەرە شوێنی ئەو دڵنیام ناتوانیت بیکەیت.

6- ڕێز لەگشت مرۆڤایەتی بگرە هەروەك چۆن حەزدەکەیت خەڵك ڕێز لەتۆ بگرن تۆش ئاوابە بۆ خەڵك.

7- هەمیشە سەرکەوتن لەلای خۆتە ئەگەر خۆت ویستت هەبێت و هەوڵدەیت خوداش یارمەتیت دەدات و سەردەکەویت.

8- هەمیشە ویست و ئارەزووت هەبێت چونکە بەم هەستە دەتوانیت هەوڵبدەیت.

9- لەژیاندا هەوڵدە خۆت بناسیت ئینجا پلانەکانت بخە گەڕ.

10- ئەگەر تۆ ئادەمیزاد بیت هەموو کەسێکت خۆش دەوێت و ڕقت لەکەس نابێت ئەوکات هەموومان پێت دەڵێین ئادەمیزاد.

11- هەروا ئاسان متمانە بەخەڵك مەکە ئەو کەسەشی متمانەی پێت کرد وەك چاوەکانت بیپارێزە لەبەرئەوەی متمانە پیرۆزە.

12- هەرگیز و بۆ هیچ کەس خاڵی لاوازیت مەدرکێنە.

13- ئەوەی هاوبەشی خەمەکانت دەکات تەنها خودایە لەبەرئەوەی بەس خودا لەناخت ئاگادارە و لێت تێدەگات.

14- لە هەموو مرۆڤەکان خۆش بە، وتەیەك هەیە دەڵێت: (هەمیشە لە دوژمنەکەت خۆشبە، هیچ شتێك لەوە زیاتر پەستی ناکات) "ئۆسکار وایلد".

لە سەرەتای کتێبەکە تاوەکو کۆتایی زۆر شتمان روونکردەوە کە پێویست بوون، لەوە تێگەیشتین کە دڵخۆشی دونیا پەیوەستە بە باوەڕی مرۆڤ لەو خاڵەدا زۆر کەس هەڵە تێدەگات و دەپرسێت ئایا ئێمە دەبێت خۆشیەکانی ژیان وەلانێین لەپێناو دوارۆژدا واتا (قیامەت)؟ یاخود خۆمان بێبەشکەین لە خۆشیەکانی ژیان؟ ئێمە کە باسی باوەڕ و ئاینی ئیسلام دەکەین مەبەستمان لەوە نییە کە خۆمان لە خۆشیەکان بگرینەوە، لەبەرئەوە خودای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە بای خۆمان چێژ و خۆشی وەربگرین لە ژیاندا بەڵام باوەڕی ڕاستەقینە دەبێتە بنچینەیەکی پتەو بۆ مرۆڤ، لەگەڵ باوەڕ دەتوانیت زیاتر چێژ لە خۆشییەکانی ژیان وەربگرین ئینجا نرخی بچوکترین شت دەزانین کە هاتۆتە بوون وە تێدەگەین لەوەی هیچ شتێ بێ حیکمەت نەخوڵقاوە وەهەست بە گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە دەگەین وە زیاتر لە ژیان تێدەگەین، هەست دەکەین کە ئادەمیزاد چەندە پیرۆزە خودا چەندە ڕێزی لە بوونی ئادەمیزاد ناوە، لەوە تێدەگەین کە بە ڕێزگرتن لە مرۆڤەکان وە دڵخۆشکردنیان ژیان چەندە جوانتر و پڕ ماناتر دەبێت، بۆیە وەك نووسەر داوا لە تۆی خوێنەر دەکەم لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا بە ئاوەزێکی فراوان بیر لەو شتانە بکەیتەوە کە باسمان کردوون

لەکۆتاییدا دەڵێم: مادام خودایەك لە ئاسمان هەیە و پارێزگاریت لێ دەکات، ڕزق و ڕۆزیت لە دەست ئەوە، باشە بۆچی مرۆڤ دەبێت لە مرۆڤ بترسێت ؟ بۆ دەبیتە کۆیلەی مرۆڤێکی تری وەك خۆت ؟ ئینسان دەبێت یەقینی تەواوی هەبێت کە هەر شتێك لە چواردەوری ڕوودەدات خێر و باشیەکی شاراوەی تێدایە بەڵام کاتی دەوێت تا دەیبینێت.

بەر لەوەی بڵێین ماڵئاوا ژیان، هەندێك کات ڕەنگە دەرفەتی دووا دیداریشمان نەبێت بۆ ئازیزانمان، مردن دێتە بەر دەرگامان و هەر ئەو کات دەبێت ئەم ژیانەی کە وامان دەزانی هەرگیز کۆتایی نایەت جێ دێڵین، چ دیمەنێکی تراژیدی سەیرە ! خۆشەویستانمان بۆمان دەگرین شیوەنمان بۆ دەکەن، بێ ئاگان لەوەی ئاخر خورپەی دڵی ئێمە لەو کاتی هەرچەندە لە لێدان کەوتووە بەڵام مەراقی زانینی شوێنی داهاتوومانە.

هەر ئەو سات و ڕۆژە پەشیمانی دامان دەگرێت و خۆزگە بە هاتنەوەی دونیا دەخوازین، بەڵام دووای چی ؟ پەشیمانی و خۆزگە خواستن ئەو کات بێ سودە، هیچ کەسێك و شتێکت بە کەلك نایەت تەنها و تەنها کردەوە چاکەکانی خۆت نەبێت. ئەو کردەوانەی کە بە نهێنی و ئاشکرا ئەنجامت داون، خراپیەکانت وەك ئەوەی خواردنێکی ژەهراویت خواردبێت لە دەمت دێتە دەرەوە و وازیشت لێ ناهێنن، ئەوەی پێی

سەربەرز دەبیت و لە سزای خودای گەورە و ئاگری دۆزەخ دوورت دەخاتەوە چاکەکانتە، بەڵی چاکەکانتە دەتبات بەرەو لوتکەی سەربەرزی و بەهەشتی تا هەتایە. مادام خراپە و بێ ئەمری خودای گەورە سزای هەیە و چاکەش بەهەشت و سەربەرزی لە دووا دێت. بۆچی لەم ساتەوە دەست بە گۆڕانکاری ژیانت ناکەیت و هەنگاوی داهاتووت چاکە کردن و چاکە خوازی نەبێت ؟.